# کۆنتراکت

جیابونەوەو پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ، مافێکی موتڵەقی خەڵکی کوردستانە

هیچ کەسێک مافی ئەوەی نیە بڕیار بات یەکێکی تر چۆن بیر بکاتەوە یان چۆن هەبێت لە ژیاندا، بێ جیاوازی ڕەگەز و جنس

**هەموو دەسەڵاتێک ئەبێت لەگەڵ ئەو گفتەدا لاچێت کە نای باتە سەر**


ژمارە: ١ | گۆڤارێکی سیاسیی وەرزییە | مانگی یەکی ١٩٩٨




*ئەنفال بە موو لە کوشتاری جولەکەکان جیاواز نیە. تۆ ئەزانی ئەنفال و ڕۆژی حەشر چین؟

*نەوت بۆ گرنگە؟ بیرەکان کەی وشک ئەکەن؟ وەرە لێرەشەوە تەماشای مەسەلەی کورد بکە!

**مەسەلە سەرکردەکان نیە چی بکەن، ئێمەین چۆن لەبەردەمی دادگایەکدا ڕایان گرین؟**

# کۆنتراکت

ڕووداوەکانی ئەمڕۆ بە ئاسانیی ئەوە پیشان ئەدەن کە ئەو بارە ناهەموارەی کوردی تێ کەوتووە لەوە دەرچووە گفتوگۆی لەسەر بکرێت: چاوەڕێی گۆڕانە.
ئەو حیزب و دامودەزگاو کولتورەی ئێستا باڵهاوێژەو بەرپرسیارە لەم ڕۆژە بۆ ئەوە نابێت گۆڕانکاریی پێ بکرێت، هی ئەوەیە کە لای بەرێت.
هەندێک لەو گۆڕانکارییە بنەڕەتیانەی کە بتوانن کورد لەسەر هێڵی تیاچوونی ئەمڕۆوە بگوێزنەوە بۆ سەر هێڵی سروشتیی خۆی ئەمانەن:
-مرۆڤی کورد ئەبێ ئەوەی لا ڕوون و براوە بێت کە کوردستان نیشتیمانی ئەوەو دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ لەسەر ئەم خاکە دەسکەوت نیە مافێکی ئاسایی خۆیەتی و دەسەڵاتی هیچ میللەتێکی تر ڕەوایی ئەوەی نیە بڕیاری چارەنوسی ئەم بدات.
-دەسەڵاتی حوکمی ئەم تاکە کەسانە لا ببرێ و دەسەڵاتی حوکمی سیستێمێکی سیاسی بخرێتە جێگای کە دەسەڵاتدارەکان لەناو ئەم سیستێمەدا بە گوێرەی یاساو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو حوکم بکەن.
-لەناو ئەم سیستێمە سیاسیەدا: دەزگاکانی دەوڵەت ئەبێت ژیانی هەر تاکە کەسێک بێ گوێدانە جۆری بیرکردنەوەو ڕەگەزو جنس لە ڕوی ئابوریی و کۆمەڵایەتیی و ئاسایشەوە مسۆگەر بکەن. مافی سەربەستی بیرکردنەوەو جۆنیەتی هەبوون لەژێیاندا بپارێزن.
ڕێکخراوی سیاسی دەستیاوە بۆ پاراستن و گەشەپێدانی ئەم جۆرە پرەنسیپانە.
سەرکردەی ئەو حیزبانەی کە بەرپرسیارن لەم ڕۆژە ڕەشەی کوردی تێ کەوتووە، لە ئەستێرەیەکی ترەوە نە هاتونەتە خوارەوە. حیزبەکانیان لە خەڵکی هەمان میللەتن کە بەکوشتی ئەدەن، سوکایەتی پێ ئەکەن و بەرەو لەناوچوونیان کردۆتەوە. ئەو نیشتیمانەش کە فرۆشتویانەو هەر جارەو ئەیخەنە ژێر پۆستاڵی سوپای داگیرکەرێکەوە، نیشتیمانی هەزارەها شەهادەدارو چەندەها نوسەرو شاعیریشە کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەم تاوانەن.
بۆیە کارەساتەکانمان نامۆ نین و تەنها لەدەرەوە نایەن، بنکەیەکی کولتورییشیان هەیەو بە ڕۆحمان ئاشنان. کۆنتراکت ئەیەوێت بە پێی زانست، بێ کاریگەریی دابونەریت بەردەوام لە دیاردەکان بکۆڵێتەوەو ئەنجامەکانیان بگەیەنێت بە خەڵکیی.
ئەو کولتورە خراپکارەی لەسەر کارە تەنها حیزب و نیشتیمانفرۆشی لێ دروست نەبووە، تەنها بواری سیاسی نیە کە بۆتە مەیدانی جەردەو جاش، بواری ئەدەب و ڕۆشنبیرییش بووە بە جێگای نەزان و بێ موراڵ و گاڵتەجاڕ. ئەم پۆلە کوللەیەی لە ڕۆشنبیریی کوردیان داوە واتایان لە وشەدا نەهێشتۆتەوە، زمانەکولتورییەکەیان وا تێک داوە وشەکان مانای خۆیان نابەخشن. کۆنتراکت حسب بۆ هەموو وشەیەک ئەکات، هەموو قسەیەکیش لە هەموو کەسێک وەرناگرێت.
ڕووداوەکانی ئەمڕۆ هیچیان نەهێشتۆتەوە بۆ گومان. هەموو شتێک ڕون و ئاشکرایە. ئەوانەی لە کوردستاندا دەسەڵاتیان هەیە تەحەددای خۆیان پیشان داوە؛ دزیی، جەردەیی، کوشتن، خیانەتی نیشتیمان، هیچ نەماوە نەیکەن. ئەو نوسەرو شەهادەدارانەش کە بە کردار یان بە بێدەنگیی هاوکارن ئەزانن پارەو پایەیان لە چی دەست ئەکەوێت یان پشتیان کردۆتە چی.
کێشەکە ئەو کەسانەن کە بەردەوام تیا ئەچن و تا ئێستا بەشێوەیەکی گشتی تێ نەگەشتوون کە بەرەنگاربوونەوە بەشێکە لە ژیان. تۆ ئەتەوێت ئاسایی بژیت بەڵام یەکێکی تر ئاوارەت ئەکات. مرۆڤی هیچ کۆمەڵگایەک ناتوانێ بە ئاسایی بژی ئەگەر خەڵکەکەی بە سیستێمێکی سیاسی ڕێبەستیی دانەنابێت بۆ دەسدرێژیی پیاوخراپان.
کورد شیاوی ئەم هەموو زوڵمو سوکایەتیە نیە کە پێی ئەکەن. میللەتێکە ئەوەندەی خەڵکی میهرەبان و دڵسۆز و لێزان هەیە کە بتوانێت کاری خۆی بە ڕێوە بەرێت. سەرکردەی حیزبەکان کە کەسانی خراپ و شەهادەداری هەڵپەرست ئەهێننە پێشەوە لەبەرئەوە نیە کورد پیاوچاکی تیا دەس ناکەوێ و خوێنەوارەکانیشی هەر ئەوانەن، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە کاری خراپی ئەوان بە خەڵکی خراپ و درۆی خوێنەوارو نوسەری بێ موراڵ مەیسەر ئەبێت.
هەڵە سیاسیەکە لە خەڵکەکەدا نیە بەڵکو لەو دامودەزگایەدایە کە لەسەر کارە. دەسەڵات بە دەس کێوەیە؟ بەرەی باش یان بەرەی خراپ؟ ئەمەیە کە دەست نیشانی ئەوە ئەکات ڕێڕەوی خەڵکێک بەرەو کوێ ئەبرێت.
"کۆنتراکت" بە پێچەوانەی زۆربەی شەهادەدارو بەناو ڕۆشنبیرانی کوردەوە کە دوای هەر کارەسات و خیانەتێک ڕەخنەو ئەسیحەت و پرۆژەی یەکگرتن ئەنێرن بۆ سەرکردەی حیزبەکان، بە ئاشکرا ڕای ئەگەیەنێت کە:
•سەرکردەی حیزبەکانی باشور ڕەوایی سیاسیان نەماوە ئەبێت لاچن.
•حیزبەکانی باشور حیزبی سیاسی نین تا داواکاریی سیاسیان لێ بکرێت.
دەسەڵاتی حیزبەکانی باشور بەردەوامیی داوە بە ڕەوی خەڵکیی و لە ڕێگای هەتنەدەرەوەدا ژمارەیەک لە سەرسنورەکان دەکوژرێن، ژمارەیەکی تر لە دەریاکاندا ئەخنکێن بۆ ئەوەی لە باشترین حاڵەتدا پاش فرۆشتنی سامان و هەڵکەندن بە دەربەدەریی بگەن. شەڕەکانیان کە شەڕی وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستانە دژی کورد خۆی پەیتا پەیتا لاشەی لاوی کورد ئەنێرێتەوە بۆ خێزانە هەژارەکانیان.
کۆنتراکت لای وایە پڕۆژەدەرکردن، ڕەخنەگرتن و ئەسیحەتناردن بۆ سەرکردەی ئەم حیزبانە:
•قبوڵکردنی ئەو سوکایەتییەیە کە بە مرۆڤی کوردو مەسەلەی کوردی ئەکەن.
•دوپاتکردنەوەی حوکمی موتڵەقی سەرکردەی حیزبەکان و پلەنزمیی مرۆڤی کوردە کە سەرکردەکان هەرچیەک بە کورد بکەن دەسەڵات و بڕیار هەر هی خۆیانەو ملکەچییش ئەرکی سەرشانی خەڵکییە.
کۆنتراکت دەنگی ئەو کەسانەیە کە لایان وایە:
•چارەسەر لەدەرەوەی حیزبەکانە. مەسەلە سەرکردەی حیزبەکان نیە چی بکەن، مەسەلە ئێمەین چۆن لەبەردەمی دادگایەکدا ڕایان گرین؛ مەسەلە ئێمەین چۆن سیستێمێکی سیاسی دابمەزرێنین کە لایەنی کەمیی بەرژەوەندیی هەر هاووڵاتیەک مسۆگەر بکات.

١٩٩٧/١٢/١٠

## لەم ژمارەیەدا ئەم بابەتانە ئەخوێنیتەوە





## حیزبەکان ئەو قۆناغەیان بەجێ هێشتووە ڕەخنەیان لێ بگیرێت

# لەم ژمارانەوە تەماشای مەسەلەی کورد بکە!







لە ساڵی ١٩٧٢دا، نەوت و گازو خەلوز (٩٧٪)ی سەرچاوەی وزەی جیهانیان دابین دەکرد. لە هەمان ساڵدا، وڵاتانی ئەندامی "ئۆپێک" نرخی نەوتیان زیاد کرد و یەکێک لە گەورەترین ئەزمەی سیاسیان دروست کرد. لە نێوانی ساڵانی ١٩٧٣ و ١٩٧٥دا، نرخی نەوت بوو بە دوو قات. کاتێک ئەو نەوتەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەنێررایە دەرەوە ١٠٧ ملیارد بەرمیل کەمی کرد، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی کە وڵاتە پیشەسازییەکان لە جاران زیاتر بەرامبەر بەو ڕاستییە ببنەوە کە دەبێت یان ئەلتەرناتیڤێک (جێگرێک) بۆ نەوت بدۆزنەوە، یاخود دەبێت بەتەواوەتی ئەو سەرچاوەی وزەیە بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا گەلێک پرۆژەی جیاوازی وەکو؛ وزەی هەوا، وزەی خۆر، وزەی ئاو (لە تاڤگەو ڕوبارەوە)، وزەی ئەتۆمیی، بۆ دۆزینەوەی جێگرێک بۆ نەوت دەست پێ کرا. بەڵام زۆربەی ئەو پرۆژانە هەر لەسەرەتاوە وازیان لێ هێنرا و هەندێکیشیان کە هەتا ئەمڕۆش هەن، ڕێژەیەکی زۆر کەم وزە دروست دەکەن. لەهەموویان سەرکەوتوتر، پرۆژەی وزەی ئەتۆمیی بوو کە لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا تەنها لەسەدا یەکی (١٪) وزەی جیهانیی دابین ئەکرد. وزەی ئەتۆمیی لە ساڵی ١٩٩٣دا گەیشتە (٧٪). بەڵام هێشتا نەوت و گازو خەلوز (٩٠٪)ی سەرچاوەی ووزەی جیهانن.

## نەوت و سیاسەت

دۆزینەوەی جێگرێک بۆ نەوت چەند مەسەلەیەکی تەکنیکیە، دە ئەوەندەش مەسەلەیەکی سیاسیە. ئەمڕۆ پیشەسازیی نەوت یەکێکە لە گەورەترین پیشەسازییەکانی جیهان و بە ملوێنەها کەس ئیشی تیادا ئەکەن. کۆمپانیا گەورەکانی نەوتی وەکو شێل، بریتیش پیترۆلیوم، ئێکسۆن، ئەمۆکۆ، چێڤرۆن و مۆبیل، هەر یەکەیان ساڵی بە دەیان ملیار دۆلار لەم پیشەسازییە قازانج دەکات. ئەم کۆمپانیانە بە هەموو شێوەیەک دژی هەر هەوڵێکن کە بدرێت بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەیەکی دیکەی وزە کە جێگای نەوت بگرێتەوە. لەسەرو هەموو ئەمانەشەوە، نەوت وەک ئامێرێکی دەسەڵات لە لایەن هەندێک وڵاتەوە بەکار دەهێنرێت بۆ گەیشتن بە هەندێک مەرامی سیاسی خۆیان. کۆمپانیا نەوتەکان دەستی درێژی سیاسەتی وڵاتەکانیان و ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە کێشانی ڕێبازی سیاسیی ئەو وڵاتانەی کە نەوتی لێ دەردەهێنن. عێراقی پێش حەفتاکان و ئێرانی

**•ڕاوێژێکراوێکی ئەمەریکیی: "شەڕی سارد ئێمەو سۆڤیەت کردمان، ژاپۆن بردییەوە".**

**•نزیکەی ٦٦٪ی نەوتی جیهان کەوتۆتە ٥ وڵاتەوە: سعودیە، عێراق، کوێت، ئێران، ئیماراتی عەرەبی.**

**•نەوت و گاز ٦٣٪ی سەرچاوەی وزەی جیهانن.**

سەردەمی شاو وڵاتە عەرەبیەکانی کەنداو و نێجیریاو مەکسیک و بەرازیل چاکترین نموونەی ئەو مەسەلەیەن.
شەڕی کەنداو نەک تەنیا نیوەی سەرچاوەی وزەی جیهانی خستە ژێر کۆنترۆڵی ئەمریکاوە، بەڵکو چەکێکی بەهێزیشی دا بە ئەمەریکا بۆ ئەوەی لە بەربەرەکانیدا لەگەڵ یەکەم هێزی ئابووریی لە جیهاندا "ژاپۆن" بەکاری بێنێت. لە کاتێکدا سۆڤیەت و وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا ڕێژەیەکی زۆری بووجەی ساڵانەی خۆیان لە خۆ پڕچەککردندا سەرف ئەکرد، ژاپۆن بە پلەی یەکەم و ئەڵمانیا بە پلەی دووەم، کە ڕێیان نەئەدرا لەشکری بەهێز دروست بکەن. دەسەڵاتێکی ئابووریی گەورەیان دروست کرد. لە ساڵی ١٩٩٢دا لە ئالاسکا، لە کۆبونەوەیەکدا دەربارەی نەوت، نوێنەرێکی ئەمریکی کە لە سەردەمی ڕیگندا ڕاوێژپێکراو بوو لە مەسەلەی وزەدا، سمینارەکەی بەم ڕستەیەی خوارەوە دەست پێ کرد: "شەڕی سارد ئێمەو سۆڤیەت کردمان بەڵام ژاپۆن بردیەوە". ئەمڕۆ نەوتی هەموو وڵاتە عەرەبیەکانی کەنداو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و نەوتی عێراق بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی سیاسیی و سەربازیی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادایە.

## جەنگی کەنداو نیوەی نەوتی جیهانی خستە ژێر دەسەڵاتی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکاوە

بۆیە بۆ دابینکردنی وزە بۆ پیشەسازییەکانیان، ژاپۆن بە پلەی سەرەکی، کە لەخاکی خۆیدا نەوتێکی وای نیە، وە ئەڵمانیا بە پلەی دووەم، هەوڵ دەدەن پەیوەندی لەگەڵ ئێراندا کە پێنجەم نەوتی دۆزراوەی هەیە، بەهێزبکەن و لەژێر دەسەڵاتی ئەمریکیدا نەمێنن. وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بە هەموو شێوەیەک دەیەوێت بەرهەڵستی ئەم هەنگاوە بکات و هەر لەبەرئەوەشە زوو زوو کارە تێرۆریستیەکانی ئێران دێنێتە پێشەوەو وڵاتانی جیهان ئاگادار دەکاتەوە کە لەگەڵ وڵاتێکدا بازرگانی نەکەن کە حکومەتەکەی یارمەتی ڕێکخراوە تێرۆریستییەکان دەداو دژی مافی مرۆڤ و ئازادیی ڕایخۆ دەربڕینە. وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا یەکەم وڵات بوو کە پشتیوانیی لە هەڵوێستی ئەڵمانیا کرد لەم ڕوداوانەی دواییدا لەگەڵ ئێران. بەڵام لە پێش هەموو لایەکدا وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا خۆی دواییش ژاپۆن و ئەڵمانیاو هەموو ئەو وڵاتانەی دیکە کە بازرگانیی لەگەڵ ئێراندا دەکەن ئەو ڕاستییە باش دەزانن کە ئەو قسانە تەنیا حیواری سەرشانۆن و تەنیا بۆ جەماوەرن و وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا خۆشی بازرگانیی لەگەڵ گەلێک دەوڵەتدا دەکات کە گەلێک لەو پرەنسیپانە پێشێل دەکەن کە بەندە سەرەکییەکانی مافی مرۆڤی لێ پێکهاتووە.

## نەوتی دۆزراوەی جیهان

کەس نازانێت چەند نەوت لە ژێر زەویدا هەیە. لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنیکی بەشوێن نەوت گەڕان و دەرهێنانی نەوت لە قوڵایی جیاوازدا، لە داهاتوودا ڕەنگە نەوت لە زۆر جێگای زەویدا بدۆزرێتەوە. هەر کاتێک نەوت دەدۆزرێتەوە، ڕێژەکەی دیاری دەکرێت و دەخرێتە سەر کۆی نەوتی دۆزراوەی جیهان.
لە کۆتایی (١٩٩٣)دا نەوتی دۆزراوەی جیهان هەڵ سەنگێنرا بە سەدو سیو شەش ملیارد (١٣٦٠٠٠٠٠٠٠٠٠)تەن. دوولەسەرسێی (٦٦٪)ئەومیقدارە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە. نەوت سەرچاوەی (٦٥٪)ی وزەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. (٢٦٪) وزەی ئەوروپای ڕۆژهەڵات و (٤٦٪) وزەی ئەوروپای ڕۆژئاوا لە نەوتەوە دێت. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەورەترین نەوتنێرەدەری جیهانە. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (٥٣٪) نەوتی جیهان ئەنێرێتە دەرەوە. نزیکەی دوو لەسەر سێی نەوتی دۆزراوەی جیهان کەوتۆتە پێنج وڵاتی کەنداوەوە: سعودیە، عێراق، کوێت، ئیماراتی عەرەبی، ئێران. بڕوانە خشتەی ژمارە(١).

| ولات | ڕێژەی سەدیی نەوتی جیهان.(خ:١) |
|---|---|
| سعودیە | ٢٥.٩ |
| عێراق | ٩.٩ |
| کوێت | ٩.٦ |
| ئیمارات | ٩.٤ |
| ئێران | ٩.٢ |

سعودیە ساڵی (٩.٢) ملیارد بەرمیل نەوت دەردەهێنێت بەرامبەر وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا کە ساڵی (٤.٢) ملیارد نەوت دەردەهێنێت. ئەمڕۆ (٤٠٪)ی سەرچاوەی وزەی جیهان لە نەوتەوەیە و (٢٧٪) لە خەڵوزو (٢٣٪)ی لە گازەو تەنیا (٧٪) لە هێزی ئەتۆمییەوە دێت. بە پێشبینی دەزگای وزەی جیهانیی تا ساڵی ٢٠١٠ بەکارهێنانی وزە (٥٠٪) زیاد ئەکات و نەوت (٣٧٪) و گاز (٢٩٪) و خەڵوز (٢٤٪) و هێزی ئەتۆمی (٦٪)ی وزەی جیهان دابین دەکەن. بە واتایەکی دیکە، نەوت و گاز بە تەنیا سەرچاوەی ٦٣٪ی وزەی جیهان دەبن.
ئەگەر بەهەمان ڕاددەی ئەمڕۆ دەربهێنرێت، نەوتی سعودیە بەشی ٨٨ ساڵ ئەکات. نەوتی کوێت و ئیمارات و عێراق(#) و کازاخستان و تورکمانستان و ئۆزبەکستان(##) بەشی زیاتر لە سەد ساڵ دەکات. بەڵام نەوتی تا ئێستا دۆزراوەی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، کەنەدا، بەریتانیا و ئوسترالیا یەکی بەشی دەساڵ کەمتر دەکەن.

## کورد و نەوت

مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پڕە لە بەربەرەکانی و زۆربەی




دەوڵەتەکانی ناوچەکە لە لایەن ڕژێمی ناجێگیرەوە حوکم دەکرێن کە گەلێک گیروگرفتی ناوخۆیان هەیە. بەپێی هەندێک پسپۆڕی سیاسی، پیش کۆتایی ئەم سەدەیە، گۆڕانکاریی زۆر گەورە بەسەر ناوچەکەدا دێت. هەر گۆڕانکارییەک کە ببێت بەهۆی کەمکردنەوە یان وەستانی دەرهێنانی نەوتی ناوچەکە وەیان ڕێگای ناردنەدەرەوەی نەوتەکە (دەربەندی هورمز) بگرێت، ئەوا گەرمترین ئەزمەی سیاسی لە جیهاندا دروست دەکات. شەڕی کەنداو بەڵگەیەکی زیندووی ئەو مەسەلەیە.
دروستکردنی چەندەها بنکەی سەربازیی ئەمەریکیی لە وڵاتەکانی کەنداوداو بەهێزکردنی بنکەکانی ناتۆ لە تورکیا و سووربون لەسەر کۆتایی پێهێنانی گیروگرفتی نێوان ئیسرائیل و وڵاتە عەرەبییەکان ڕێ بۆ وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا خۆش دەکا کە هەم هێزێکی سەربازیی ئامادەی لە ناوچەکەدا هەبێت و هەم لە گیروگرفتی دیکەوە نەئاڵابێت تا لە کاتی پێویستدا بتوانێت گۆڕانکارییەکانی ناوچەکە بە شێوەیەک ئاراستە بکات کە بە بەرژەوەندی خۆیان تەواو ببێت و سەرچاوەی وزەی جیهان نەخاتە مەترسییەوە. ئەو هەوڵانەی کە لەم دوو ساڵەی دواییشدا دران بۆ ڕاگرتنی شەڕی نێوان دوو ڕێکخراوە سەرەکییەکەی کوردستانی عێراق بەشێکن لەو پلانە. ئاشکرایە کە مەسەلەی کورد ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە داهاتووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. تا چ ڕادەیەک ئەو ڕۆڵە بە قازانجی میللەتی کورد دەشکێتەوە، بەستراوە بە زۆر فاکتۆرەوە بەڵام لە هەموویان گرنگتر فاکتۆری کورد خۆیەتی*

### سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

# ئەم ڕێژەیەی ئەمڕۆ زۆر زیاد ئەکات کاتێک ئابلۆقەی ئابوری بە تەواوەتی لەسەر عێراق لا ببرێت.

## ئەم سێ وڵاتەی دوایی ئێستا میقدارێکی کەم نەوت دەردەهێنن و لە داهاتودا ڕێژەی دەرهێنانی نەوت زۆر زیاددەکات.

1-Marian R, 1995. Tjugo år efter olje krisen.SNS förlag, Stock. 84p.
2-Physical resources and environment. Fossil fuels(Block4,Energy1), 1995. The open university. 152p. Printed by Eyre and spottiswood limited, M.Kent
3-Larry N.,1997. Globaly it was a very good year. American Association of petroleum geologis, Explorer.p.1+14

## سەددام بۆڵبرینی سیاسەتی ئەمەریکییە

**فەرید زەکەریا** ئەڵیت: ئەگەر سەددام حسەین نەبوایە، ئەمریکییەکان ناچار بوون خۆیان پەیدای کەن. سەددام بۆڵبرینی سیاسەتی ئەمەریکییە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. کەنداوی فارسی، لەبەر هەبوونی سامانی نەوت کە خوێنی دڵی جیهانی وڵاتە پیشەسازییەکانە، ناوچەیەکی بەرژەوەندیی زیندووی ئەمەریکایە. سیاسەتی ڕاگرتنی تەرازوی هێز وا لە ئەمەریکییەکان ئەکات کە نەهێڵن وڵاتێکی دوژمن-هەڵوێست باڵهاوێژ بێت لە ناوچەکەدا. وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا زیاد لە چل ساڵە ئەم سیاسەتە پیادە دەکات.

**سەرچاوە: گۆڤاری تیمپوس، سێپتەمبەر، ١٩٩٦.**

# دوو وڵات دوو سیاسەت یەک واتا



**وێنەیەکی گواستنەوەی تاڵانیی سەدی بەخمە بۆ ئێران، خەڵکێ جەردە سەرکردەی بێ هەر دزی تیا هەڵ ئەکەوێ**

سەروەر ئەحمەد
١٩٩٧.٠٦

سیاسەت ئەمڕۆ لە کوردستاندا وێنەیەکی نێگەتیف ئەدات بە خەڵکیی. ئەمەش تیشکدانەوەی کارو هەڵسوکەوتی چەندین ساڵەی پارت و ڕێکخراوەکانە. نمونەی وەکو درۆ، دزیی، جنێو و بێڕێزیی، کوردکوشتن، تاڵانیی و خیانەت بە ئاسانیی لە ڕێکخراوەکانەوە بە گشتی ئەبینرێت. بەڵام بۆئەوەی خەڵکیی سیاسەت تەنها لە چوارچێوەی ئەو ڕێخراوانەدا نەبینێت، پێویستە چەندین ڕونکردنەوەو نمونە لەسەر کاری سیاسی بهێنرێتەوە تاکو ئاسانتر جیاوازیی نێوان ئەو ڕێکخراوانەو ڕێکخراوی سیاسیی ببینرێت کە بە ڕاستی نەک بە درۆ خاوەنی بیروباوەڕ، ئامانج و هەڵسوکەوتی سیاسین.

## سیاسەت چیە؟

سیاسەت ناکۆکییە لە نێوانی گروپەکانی کۆمەڵگادا کە خاوەنی ئایدۆلۆجی جیاوازن لەسەر بۆچونی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا. ئەم ناکۆکییەش کارێکی سروشتییە، چونکە ئەو دەرامەتەی کە وڵاتێک هەیەتی دەرامەتێکی دیاریکراوەو ناتوانێت بە تەواوی ویستی هەموو لاکان پڕبکاتەوە. بۆ نمونە؛ ساڵی ١٩٧٠ مەسرەفی دەوڵەتی سوید (٤٣.٩٪)ی سەرجەمی بەرهەمی وڵاتەکە بووە. ساڵی ١٩٨٢ دەگاتە (٦٦.٦٪)ی سەرجەمی بەرهەم بەڵام ساڵی ١٩٨٩ دەبێت بە (٥٩.٩٪)ی.

## ئایدۆلۆجی

ئایدۆلۆجی بەوە پێناسە دەکرێت کە کۆی ئەو پرەنسیپانەیە کە دەبێتە ئامانج و هەڵسوکەوتی سیاسی گروپ و ڕێکخراوەکان. بەگشتی ئایدۆلۆجیە سەرەکیەکان بریتین لەمانەی خوارەوە:-

**لیبرالیزم:** بە زۆریی پێ لەسەر تاکەکەسیی دائەگرێت. ئازادیی تاکەکەس بە پرەنسیپی سەرەکی ئایدیۆلۆژیکە دادەنرێت. لیبرالیزم داوای مافی: ژیان، ئازادیی و خاوەندارێتی دەکات بۆ مرۆڤ. بە پێی ئەم پرەنسیپانە تاکە کەس خۆی مافی بڕیاری ژیانی خۆی هەیە، ئازادانە بیر ئەکاتەوەو بەشداریی بڕیارە سیاسیەکان ئەکات لە

**•هەبوونی سیاسەت پەیوەندی بە دەوڵەمەندی و هەژاریی وڵاتەکەوە نیە.**
**•ئەریتیریا بەنداو دروست ئەکات، حیزبەکان سەددی بەخمە ئەدزن.**
**•ئەریتیریا هێڵی شەمەندەفەر ڕائەکێشێت، حیزبەکان هێڵی جاسوسی وڵاتان.**

وڵاتەکەدا. مافی خاوەندارێتی تاکەکەس پارێزراوەو دەوڵەت بۆی نابێت بە هەموو شێوەیەک دەست بخاتە کاروباری بازاڕەوە.

**کۆنسێرڤاتیزم:** ئایدۆلۆژییەکە کە دەیەوێت پارێزگاریی دابونەریتە کۆمەڵایەتیەکانی وەکو کولتور، ئایین و خێزان بکات. بە پێی ئەمان پێکهێنەری کۆمەڵگا خێزانە نەک تاکەکەس. کۆنسێرڤاتیزم دژ بە شۆڕشکردنە بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا. دابونەریتەکان دەبێت لەسەرخۆ بگۆڕرێت نەک ڕادیکاڵانە.

**ناسیونالیم:** نەتەوەو وڵات بە پێکهاتێکی ئۆرگانیی دائەنێت، کە بەردەوام لە پێناوی مانەوەدا لە پێشبڕکێ و دژایەتیدایە لەگەڵ نەتەوەو وڵاتانی دیکە. لەبەرئەوە ئەبێت ئامانجی تاکەکەس و گروپ و ڕێکخراوەکان لە پێناوی مانەوەو پێشخستنی نەتەوەو وڵاتدا بێت. ناشونالیزم نەتەوەو وڵات لەسەرو تاکەکەس و ڕێکخراوەکانەوە دەبینێت. لەبەرئەوە بۆچونی ناسیونالیستانە دەتوانێت لە ڕێکخراوە جیاوازەکانی تریشدا کە خاوەنی ئایدۆلۆجی دیکەن، جێگەی خۆی هەبێت.

**سۆسیالیزم:** ئەو پرەنسیپە گرنگانەی کە سۆسیالیزمی لەسەر دامەزراوە بوونی یەکسانی ئابوریی و کۆمەڵایەتی و سیاسیە. یەکسانی ئابوری واتە نەهێشتنی جیاوازیی لەدەرامەتدا. ئامانجی یەکسانی کۆمەڵایەتی نەهێشتنی چینایەتی و جیاوازی کۆمەڵە

## ڕێکخراوی ناوچەیی ناتوانێت ئامانجی هەموو کۆمەڵەکە بێت

کۆمەڵایەتیەکانە. پرەنسیپی یەکسانی سیاسی نەهێشتنی جیاوازیی دەسەڵاتی سیاسیە لا نێوانی مرۆڤدا. دەستیاوی نەهێشتنی جیاوازیەکانیش دەسبەسەراگرتنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و داهاتەکانە لە لایەن دەوڵەتەوە. بەڵام سۆسیالیستەکان یەک نین لەسەر ڕێگای گەیشتن بەم ئامانجە. هەندێکیان ئەیانەوێت ڕادیکاڵانە لە ڕێگای شۆڕش و کۆدەتاوە بگەن بەم ئامانجە، بەڵام هەندێکی دیکەیان وردە وردە داوای گۆڕانکارییەکان دەکەن، وەکو سۆسیالدیموکراتەکان.

لێرەدا دوو خاڵ ئەکەوێتە بەر چاو:

١- ئەو ڕێکخراوانەی ئێمە بەدەم لافی هەرچیەکیان لێ دابێت، بەڵام لە کرداردا هیچیان بۆ هیچ کام لەو شتانە نەکردووە کە ئایدۆلۆجیە جیاوازەکان دەستی ئەخەن. ئازادیی مرۆڤ، ڕزگاریی نەتەوە، یەکسانی، پاراستنی سامانی خەڵک، ئەمانە لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا، بە پێچەوانەوە، توشی زیانیش بوون.

٢- ڕێکخراوەکان زیاتر لەسەر پەیوەندیی وەکو خزمایەتی و ناسیاویی دروست بوون نەک پرەنسیپی سیاسی. ئەم شێوە پەیوەندییەش ڕێکخراوی ناوچەیی پێک ئەهێنێت کە ناتوانێت ئامانج و بۆچونەکانی هەموو کۆمەڵگاکە بێت.

## سوید

خەرجی دەوڵەت لە ساڵی ١٩٨٧دا بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش کراوە:

بەرگریی ٧.٢٢ ملیار کرۆن. دادوەریی ٢.١١ملیار کرۆن. خوێندن ٥.٤٥ملیار. تەندروستی٦.٩ملیار. کاروباری کۆمەڵایەتی ٨.٤٤ملیار. ئیدارەی گشتی٨.٢١ملیار. شتی دیکە ٥.٤٠ملیار.

مەسرەفی شارەوانیەکان لە ساڵی ١٩٩٠دا ٣.١٣٥ملیار بووەو بەم شێومیە دابەش کراوە:

چاودێریی منداڵ: ٣.٢٧ملیار. چاودێریی پیرو پەککەوتە: ٢.٢٠ملیار. خوێندن: ٢.٤٢ملیار. شتی تر: ٧.٤٥ملیار.

ناکۆکی نێوانی ڕێکخراوە سیاسیەکان لێرەدا، جیاوازیی بەکارهێنانی ئەو ژمارانەیە. ڕێکخراوەکان بە پێی ئایدۆلۆجیەکانیان ئەکەونە ناکۆکییەوە لەسەرئەوەی چۆن وڵاتەکە بەڕێوە بچێت. بۆ نمونە کاتێک خەرجێنەی دەوڵەت کورتی ئەهێنێت، پارتەکان بۆچونیان جیاواز ئەبێت لەسەر ئەوەی کە ئەو پارەیە چۆن پەیدا بکرێت، چەند لە بەرگریی یان پارەی چاودێریی پیرو پەککەوتە کەم کەنەوە. یاخود چۆن و چەند باج لەسەر کێ و لەسەر چی زیاد بکەن.

سۆسیالیستەکان ئەیانەوێت داکۆکی لە بەرژەوەندیی کەمدەرامەتەکان بکەن، کۆنسێرڤاتیڤەکان بەلای کاپیتالیستەکان و دەوڵەمەندەکاندا ڕای ئەکێشن.

لە کاتێکدا سیاسەت بیر لەوە ئەکاتەوە کە چی بکات بۆ نەخۆش و چۆن خەستەخانەکان بەڕێوە بچن، پارتەکانی ئێمە بە بەرچاوی هەموومانەوە ئامێری ناو خەستەخانەکان ئەدزن.

لەوانەیە هەبێت داکۆکی لە سیاسینەبوونی حیزبەکانی ئێمە بە گشتی، بەوە بکات کە سوید و کوردستان بەراورد ناکرێن، چونکە سوید وڵاتێکی پێشکەوتو و دەوڵەمەندە. بەڵام ئایا هەبوونی سیاسەت بەستراوە بە دەوڵەمەندییەوە؟ تەماشای ئەم نمونەیەی تر بکە.

## ئەریتریا

ئەریتریا وڵاتێکە لە کوردستان هەژار تر. چەند جارێکیش توشی کارەساتی لەبرسامردن بووە. ئەریتیرییەکان توانیان خۆیان لە ئەسیوپیادا جیا کەنەوەو ڕزگاربن.

دوای ڕزگاریی بۆ بەربەستکردنی مەترسیی برسێتی کەوتنە دروستکردنی بەنداو. خەڵک لە تەمەنی (١٨)ەوە بۆ (٣٥) ئەرکی بەشداریی دروستکردنەوەی نیشتیمانی کەوتە سەر. بۆ دروستکردنی هێڵێکی ٣٥٠ کیلۆمەتریی شەمەندەفەر، کە زۆربەی ناوچەکان ببستێت بە "ئەسمەرە"ی پایتەختەوە، "بانکی جیهانیی" بڕیاری دا کە یەک ملیار کرۆنی سویدیان بداتێ بە قەرز. بەڵام سیاسیەکانیان بڕیاریان دا کە ئەو قەرزە وەرنەگرن، لەسەر قاچی خۆیان بوەستن و



**حیزبەکان هەرچی بۆ ئاوەدانکردنەوە ئەشیا کردیان بەودیوداو، هەرچی وڵاتیشی پێ وێران ئەکرێت هێنایانە ئەمدیوەوە.**

نەکەوونە ژێر دەستی بێگانەوە. خۆیان کەوتنە بەکارهێنانەوەی هێڵی وێرانی کۆن و وایان بە باش زانی کە هێڵێکی سەرەتایی خۆیان ڕای کێشن باشترە لە هێڵێکی مۆدێرن کە بیان خاتە ژێر قەرزەوەو ڕێ لە پێشکەوتنی وڵاتەکە خۆی بگرێت.
نمونەی سوید و ئەریتیریا پێمان ئەڵێت؛ سیاسەت لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر چەند جیاواز بێت لەوەدا یەک ئەگرنەوە کە "سیاسەت" لە خزمەتی مرۆڤەکاندایە نەک لە دژیان. سیاسەت چەند جیاواز بێت هەر نابێت بەوەی کە ئەریتیریا بەنداو دروست ئەکات پارتەکانی باشوری کوردستان سەدی بەخمە بدزن. کە ئەریتیریا هێڵی شەمەندەفەر ڕائەکێشێت پارتەکانی ئێمە هێڵی ئیتیلاعات، میت و موخابەرات ڕابکێشن*

سەرچاوەکان:
Långtids Utredningen, 1990,
SOU90:14
UNT, 1997.04.29

## ئەریتیریا

ئەریتیرایا وڵاتێکە ئەکەوێتە سەر خوارووی ڕۆژهەڵاتی دەریای سوور. دانیشتوانی نزیکەی ٣ ملیۆن کەسە. لە بیست ساڵی کۆتایی ساڵانی ١٨٠٠ەوە لەژێر دەستی ئیتالیادا بوو تا ساڵی ١٩٤١ کە کەوتە ژێر دەستی هێزەکانی بەریتانیاوە. لە ساڵی ١٩٥٢دا نەتەوە یەککگرتووەکان بڕیاری دا کە ئەریتیریا ببێت بە وڵاتێکی فیدراڵ لەگەڵ ئەسیوپیا. لە ساڵی ١٩٦٢دا ئەسیوپیا سیستێمی فیدرالیەکەی هەڵوەشاندەوەو ڕاستەوخۆ حوکمی ئەریتیریای گرتە دەست خۆی. لەو کاتەوە کە فیدرالیەکە هەڵوەشایەوە، ئەریتیریا لە شەڕێکی گەرمدا بوو دژی ئەسیوپیا. تاکو ساڵی ١٩٩٣ سەربەخۆیی تەواوی وەرگرت.

ئەم سەربەخۆییەش دەگەڕێتەوە بۆ خەباتی ٣٠ساڵەی بزووتنەوەی سەربەخۆیی EPLF. بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەش لەگەڵ ئۆپۆزیسۆنی ئەسیوپیادا؛ EPRDF هاریکاربوون تا لە ساڵی ١٩٩١دا ڕژێمی مارکسیستی مێنگیستۆڕوخێنرا*

UNT. 1997.04.29

**"نەوت" و "ئاو"**

**سەرچاوەی زۆربەی شەڕو ناکۆکی دنیا،**
**ژمارەی داهاتوو**

# کورد، میللەتێکی بێ کۆنتراکت

ناسر حەفید
١٩٩٧/٨




وێنەی[ژ:١] ئەگەر ڕیشەدەمارەکان، لە گورچیلەدا خوێن لە میز پاک نەکەنەوەو لە سی دا گازەکان ئاڵوگۆڕ نەکەن، تۆ ناتوانیت بە پێوە بوەستیت. لەشی سیاسی هەر جولانەوەو ڕێکخراوێکیش لەسەر ئەو ڕیشەبەستییە ڕائەوەستێت کە لەشەکە لە نێوانی خۆی و خەڵکەکەیدا دروستی ئەکات.

## ڕوتێکردنی سیاسی یەکەم

### گفتی پارتی: *کوردستان یان نەمان*

ساڵی ١٩٦١ جوڵانەوەی چەکداریی لە باشوری کوردستاندا دەستی پێ کرد. سەرکردەکانی چونە ژێر باری گفتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە: "*ڕزگاریی کوردستان و خزمەتی مرۆڤی کورد*". بۆ بەدی هێنانی ئەم مەبەستەش وەکو **لایەنی یەکەم** داواکارییان لە خەڵک پشتگیریی و قوربانیدان بوو. بەڵام ئایا خەڵک وەکو **لایەنی دووەم** بەدەم داواکاریی سەرکردەکانەوە چون؟ ڕویان تێ کردن؟ وەڵام: بەڵێ. کورد بە گشتی دڵی بەخشی بە سەرکردەکانی. ئەم چەند نمونانە نیشانەی ئەو ڕوتێکردنە سیاسیەن:-

*لە حامیەی سلێمانی، ساڵی ١٩٦٣ چەند کەسێک گوللە باران کران لەسەرئەوەی کە ئامادە نەبون جنێو بدەن بە مەلا مستەفا. *ژنان لە خۆشەویستیدا قوماشێکیان ناو نا: ڕیشی مامجەلال. *حەمەومین ئاغای بارێ کە لە دەسپێکردنەوەی دوای ١٩٧٥دا شەهید بوو، لەسەر بەرماڵەکەی ڕوی ئەکردە ئاسمان و ئەیوت: "*خوایە شەهادەتم بە نسیب بکەیت*". *خەڵکیی شانازیی بەوەوە ئەکرد کە کەسێکی پێشمەرگەیە. *لەناو شاردا هەرمەوزی پارەو جل کۆکردنەوە ئەکرا. *لە هەموو سلێمانیدا تاک تاکە پیاوێکی حکومەت پەیدا ئەبوو کە ئەویش هەر زوو بەدەستی پارتی ئەکوژرا. ***بەدرەدین عەلی** کە پێشتر پارێزگاری هەولێر بوو، لە بەغداد لە ماڵەکەی خۆیدا بە دەستی شێخ محەمەدی سەید عەلی و شێخ لەتیفی ئامۆزای لە تۆڵەی کورد کوشتندا کوژرا. *کە هەندێک پارەدار لە ترسی ڕەشبگیریی حکومەت باریان ئەکرد بۆ بەغداد، باوکم ئەیوت: ماڵەکەشم بەسەردا بڕوخێنن چۆڵی ناکەم، ئەوا من ڕۆشتم ئەی ئەو هەموو فەقیرە چی بکات؟ دوژمن ئەیەوێت بۆی چۆڵ کەین، ئێمە ئەبێت بمێنینەوە. *پێشمەرگە بە نانی کەڕواوی ڕازی بوو، بۆی نەبوو بچێتە ڕەزی هیچ جوتیارێکەوەو لەگەڵیاندا دروێنەو کاریان ئەکرد..هتد

ئەو ڕیشە پەیوەندی و جوڵانەوە جیاوازانە لە موراڵ، جوامێریی، قوربانیدان و هوشیاریی میللی، وەکو ڕیشە دەماری ئۆرگانەکانی ناو سنگ و سک، دەست نیشانی ڕاوەستاویی لەشی سیاسیی هەر جوڵانەوەیەک ئەکەن. {بڕوانە وێنەی ژ:١}

جوڵانەوەی ١٩٦١ هەرچۆنێک دەستی پێ کردبێت، لەناو لەشی میللەتدا، وەکو منداڵی ناو سکی دایکێک ڕیشەی بەست، پەتی

**جەلالی پاساوی هاتنەناوحکومەتی بەچی ئەداتەوە؟ کە جەلالی هاتە ناو حکومەتەوە وتی: من ماوییم. پاساودانەوەی کارێکی فیسیکی هەر بە کارێکی فیسیکیی، نەک بە فیکر، ئەدرێتەوە. پاساودانەوەی ئەوەی بەردێک بۆ نوقوم ئەبێت هەر بەوە ئەدرێتەوە کە بەردێکی تریش نوقوم ببێت.**

خۆپێوەبەستنی "ناووک"ی ڕاکێشاو لەسەر قاچی میللەتەکەی خۆی ڕاوەستا. لە ڕێگای ئەو پەتی ناووکەوە بژێوی بۆ ئەچوو. پارتی هەر ئەوەی تیا بوو کە خەڵکەکە پێی ئەبەخشی. بەم پێیە: [بڕوانە وێنەی ژ:٢]

**•بزووتنەوەکە کەوتە سەر سکەی خۆی**

**•پارتی بوو بە پارتی "ناووک"**





بەڵام ئایا سەرکردەکان چەندیان ڕێز هەبوو بۆ ئەو دڵپێدانەی میللەتەکە؟ مەسەلەی کوردیان بە کوێ گەیاند؟ ئەم پرسیارانە لە یەک پرسیاردا کۆئەکەمەوە:

**ئایا سەرکردەکان گفتەکەی خۆیان بردە سەر؟**

## کشانەوەی سیاسی یەکەم

ساڵی ١٩٦٤ پارتی بوو بە دوو بەشەوە کە بە **مەلایی و جەلالیی** ناسران. لێرەوە مێژووەکە کەوتە سەر خەتێکی تر: *مێژووی بەرەوخوارو سەرکردەی ژێرکەوتن*. ئەم دووبەشبوونە هەر لەتبونێکی میکانیکیی وەکو دووکەرتبوونی دارێک نەبوو. گۆڕانێکی جۆرێتیش ڕوویدا:-

## پارتی سۆندە

"پارتی" پەتی ناوکەکەی گۆڕیەوە بە سۆندە. مەلایی لە سۆندەی حکومەتی ئێرانەوە بژێوی بۆ ئەهات و جەلالییش لە سۆندەی حکومەتی عێراقەوە. مەلایی و جەلالیی کەوتنە سەر خەتی خوێن-پیسبوون و هاتنەخوارەوەی خورستی سیاسیان. جەلالیی و مەلایی ئیتر چاویان لە ڕوبعە شرەی ئەندام و شرەوپرەی پیتاکی ناوشاری خەڵکیی نیە. حکومەتان سەفتە پارەو چەک ئەدەن. بەم پێیە لەوە دەرچون ئەوەی ناو لەشیان هەر ئەوەبێت کە خەڵکیی پێی ئەبەخشین. ئیتر ئەوەی بڕیار ئەدات تەنها دەسەڵاتدارەکانی کوردو داخوازیی خەڵک نیە، بێگانەشە، ئەوانەی دەستیان تێ خستوون. [بڕوانە وێنەی ژ:٣]

**خۆبەستنەوە بە وڵاتانەوە نیشانەی گۆڕینەوەی خەتی سیاسی بوو بە خەتی دەسەڵات، پارتی ناووک بە پارتی سۆندە.**

## کشانەوەی سیاسی یەکەم

بە لەتبونی ساڵی ١٩٦٤ کێشەی میللەت یەکەم چەقۆی بەرکەوت. جەلالی کەوتە ئەو شوێنەوە کە پێشتر خۆی بە شوێنی جاش و خاینی لەقەڵەم دابوو. خەڵکیی بێ هیوا مایەوەو مەلایی و جەلالییش کەوتنە سەر خەتی لەمیللەت-پچڕان و دەسەڵاتی پارەوچەک و لەسەر قاچی وڵاتان-وەستان. خەڵک بە گشتی بە دڵێکی ساردەوە لە بزووتنەوەکە کشایەوە.

**جەلالی چی لە "کوردستان یان نەمان"ەکە کرد؟**

## پچڕانەوەی جەلالی ١٩٧٠

ساڵی ١٩٧٠ حکومەتی بەعس لەگەڵ مەلا مستەفا ڕێککەوت. بەیانی ١١ی ئازار خوێندرایەوە. جەلالی بەم بەیانە پچڕایەوەو هاتە سەر سفر.

## ڕوتێکردنی سیاسی دووەم

### گفتی بارزانی: کەرکوک

مەلا مستەفا بەیانی لێبوردنی دەرکرد. دوبەرەکیی کۆتایی پێ هات. چوار ساڵی ئاشتی و ئۆتۆنۆمی هەلێکی باشی ڕەخسان. ئەم هەلە بوو بە بناغەی ڕوتێکردنێکی سیاسی تر. میللەتەکە بە گشتی جارێکی تر دڵی خۆی دایەوە بە سەرکردەکانی، ئەم جارەیان: بارزانی.

**ئەی بەرزانی گفتەکەی خۆی بردە سەر؟**

**مەلایی بە ئاشبەتاڵی ساڵی ٧٥ لە باوەشی ئێراندا، پاساوی ئاشبەتاڵی جەلالیی ساڵی ٧٠ی ناو حکومەتی عێراقی دایەوە. ئەم دوانە هەرچەندە مێژوویان شەڕی یەکترییە بەڵام لە ناوەڕۆکدا بەیەکتریی نامۆ نین، *کامەیە ئەو ناوەڕۆکە؟***

لەتبونەکەی پارتی ساڵی ٦٤ هەر میکانیکیی نەبو، گۆڕانێکی جۆرێتیش ڕویدا.

پارتی ناووک ناوکەکەی گۆڕیەوە بە سۆندە.




**وێنەی ژ:٣. ئەگێڕنەوە قەلدزەکان ڕیخۆڵەی باریکیان ئەهێناو سەرێکیان گرێ ئەدا بۆ ئەوەی کە قەلەکە کەوتە قوتدانی ڕیخۆڵەکە ئەمان لەمسەرەوە فوی تێ کەن،، لە سکیدا بئاوسێ، ئنجا دەست بکەن بە ڕاکێشان و گرتنی.**

## بڵاوەپێکردنی ١٩٧٥

ساڵی ١٩٧٤شەڕ لە نێوانی پارتی و حکومەتی بەعسدا دەستی پێ کردەوە. بە قسە شەڕ لەسەر کەرکوک بوو. پاش نزیکەی ساڵێک، ئێران و عێراق ڕۆژی: ٦/٣/٧٥ لە جەزائیر ڕێک کەوتن. دوای ٦ ڕۆژ (٣/١٢) مەلا مستەفا شای ئێران ئەبینێت. لە (٣/١٣)ەوە سەرانی پارتی چەند کۆبونەوەیەک ئەکەن. لە (٣/١٩) دا بڕیاری بڵاوەپێکردنی بزووتنەوەکە ئەدەن. مەلا مستەفا کە کوردستانی بێ کەرکوک نەئەویست ئێستا بە دەستی بەتاڵ ڕازیە. بە حەوت ڕۆژ جولانەوەیەکی چواردە ساڵیی هاتە سەر سفر. {**وێنەی ژ:٤**}

## کشانەوەی سیاسی دووەم

شەڕبونەوەی ٧٤ بەرزبونەوەیەکی گەورەتر بوو بۆ کەوتنەخوارەوەیەکی توندتر. ئەم جارەش میللەتەکە چەقۆیەکی بەرکەوت، بەڵام چەقۆیەکی گەورەتر. کوردی باشور بە تێکشکاوی کەوتە بەردەمی حکومەتێک کە نەهێشتنی کوردی لە نەخشەدا بوو. ئاشبەتاڵی ٧٥ کوردی باشوری بە چوارپەلبەستراویی خستە بەردەمی کەلە سەگێکی برسی.

## ڕوتێکردنی سیاسی سێیەم

### گفتی کۆمەڵە

سوریا ئەی ویست سەریەشە بۆ حکومەتی عێراق دروست بکات. مامجەلال گۆڕەپانی چۆڵی جولانەوەی چەکداریی بە هەل زانی.

یەکێتی نیشتیمانیی کوردستان دامەزرا. ڕۆژی: ٧٥/٥/٢٢ بەیانی دامەزراندنی لە سوریا بڵاوکرایەوە. بە دروشمی دیموکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و لافیتەی ڕوخاندنی حکومەتی عێراقەوە هاتنەوە کوردستان. لە دوای ساڵی ١٩٧٦ەوە چەند ڕێکخراوێک کەوتنە شاخ، لەوانە: *کۆمەڵە*.

لە ناو هەموو هێزو پارتەکاندا کۆمەڵە جێگایەکی تایبەتی گرت. سەدان لاوی کورد لەژێر سەرکردایەتیی کۆمەڵەدا، لە بەندیخانەکانی ڕژێمدا، چونە ژێر پەتی سێدارەوە.

کۆمەڵە: وەکو *پارتی ناووک* دەستی پێ کرد. میللەت ئەم جارەیان دڵی خۆی دا بە کۆمەڵە، ئەی کۆمەڵە چی لەم دڵە کرد؟ چەندی ڕێز هەبوو بۆی؟

## کشانەوەی سێیەم

کۆمەڵە سیاسەتێکی سەربەخۆی نەبوو. هەڵگرتنی ئایدۆلۆجی مارکسی-لینینیی هەر بۆ کۆکردنەوەی خوێنەوارانی سەر بەم بیرە بوو. کۆمەڵە هەر جەلالیی بوو لەژێر فۆرمێکی نوێدا. کۆمەڵە وردە وردە ناوەڕۆکی خۆی دەرخست و توشی کشانەوەی سیاسی بوو. کۆمەڵە کە **نەوشیروان مستەفا** بەرپرسیاری یەکەم بوو لێی، ساڵی ١٩٩٢ لە کۆنفرانسی یەکێتی دا، بەڕەسمی هەڵوەشێنرایەوەو نیشیان پێی نەما.

# پرسیار: بۆ مێژووەکە لەسەر هێڵی شکست ئەڕوات؟
# وەڵام: چونکە مێژوویەکی بێ "مەرج" ە

## ڕوتێکردنی سیاسی چوارەم
**گفتی پەرلەمان**

لە جەنگی عێراق و ئێران دا حیزبەکان بە پێی سروشتی سۆندەیی خۆیان لایەن بون لە جەنگەکەداو قاچی سیاسی بەرژەوەندیی کوردیان نەبوو لە سەری بوەستن. لەگەڵ وەستانی جەنگەکەدا ساڵی ١٩٨٨، سەددام بە ئەنفال دەستی کرد بە تۆڵەسەندنەوەی خۆی. لە بەردەمی ئەم هێرشەدا حیزبەکان بوونێکی سەربازیی ئەوتۆیان نەما. پاش شەڕی کەنداو ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان دەستی پێ کرد. حیزبەکان هاتنەوە ناو شارەکان. هەرچەندە حیزبەکان چەند هەوڵێکیان دا بۆ وەستاندنی پاککردنەوەی تەواوی حکومەت لە کوردستاندا، بەڵام خەڵکی ستەمدیدەو داخلەدڵی ژێر حوکمێکی دڕندەی وەکو حوکمی سەددام، زۆربەی شارەکانی پاک کردەوەو هەلێکی گەورەی پەیدا کرد بۆ ئەوەی خۆی حوکمی خۆی بکات. لەم هەلە مێژوویە چی دروست ئەکرێت، پرسیارێک بوو وەڵامەکەی کەوتە دەستی ئەو سیستێمی دەسەڵاتەی کە حیزبە سۆندەکان بە کۆمەڵ پێکیان هێنا. چونکە هەر زوو ئەوان دەستیان بەسەر بارەکەدا گرت و خەڵکی بێ ئەڵتەرناتیفیش بە گشتی خۆی خستە دەستی ئەوانەوە. ڕۆژی ١٩ / ٥ / ١٩٩٢ پەرلەمان هەڵبژێررا. خەڵکیی زۆر دڵی پێی خۆش بوو. هەموو گفتوگۆیەک کە لەناو کۆڕوکۆمەڵەکاندا ئەکرا، لە سەر هەر شتێک بوایە؛ ئابوریی، سیاسی، ئیداریی،..هەر ئەهاتەوە سەر یەک شت: جارێ ڕاوەستن با بزانین پەرلەمانەکەمان چیمان بۆ ئەکات!

## کشانەوەی سیاسی چوارەم

بەردێک بەوە تێرت ناکات کە تۆ بە پاروو بی بینیت. پەرلەمان و فیدراڵی و حکومەتەکەیان دامودەزگای بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاکە نەبوون. بۆ ئەوە نەبوون کە چۆن میللەتەکە لە ڕوی ئابوری، سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆحیەوە هەڵ سیننەوەو بەهێزی کەن. پەرلەمانەکە چەقۆیەک بوو کوردستانیان وەکو مەڕێک پێ کرد بە دوو بەشەوە. مەسەلەی کورد گەورە بوو بوو. ئەم فۆرم و دامودەزگا پانوپۆڕانە بۆ ئەوە بوون لەناویاندا تاوانی گەورە بکرێت. چەندەها نوسەرو شەهادەپانی شرەخۆرو بێویژدان بەشدارن لە هەڵبەستنی ئەم چیخی تاوانە بە دەوری ئەو کارەساتانەدا کە سەرکردەی حیزبەکان بەسەر ئەم میللەتە بێچارەیەیدا ئەهێنن.

### سەرئەنجام:

**گفتەکان** ڕوتێکردنی سیاسی خۆیان بەدەست هێنا. میللەتەکە هەر جارەو خۆی خستۆتە ناو دەستی سەرکردایەتییەکەوە. بە درێژایی مێژووەکە خەریکی قوربانیدان و خۆ بەختکردن بووە. توشی ماڵسوتان و دەربەدەریی و ڕاکوێزان و ئەشکەنجەو ئیعدام و ڕەشەکوژیی هاتووە. مێژووەکە لە ساڵی ١٩٦٤ەوە تا ئێستا لە سەر هێڵێک هاتۆتە خوارەوە تیایدا تا هاتووە کارەساتەکان گەورەتر بوون؛ حەکاریی، هەڵەبجە، ئەنفالی سەددام، ڕەو، ئەنفالی ٩ی

حیزبەکان. خەڵکەکە جوڵانەوەکەی چۆن بینیبێ و چ هیوایەکی پێ بوبێت کاری نەکردۆتە سەر بەڕێوەبەرایەتیی جوڵانەوەکە خۆی. مێژووەکە لەدوای ١٩٦٤ەوە مێژووی دەسەڵاتی

سۆندە-سەرکردەو سۆندە-پارتی بووە. مەرامی ئەو دەوڵەتانەی هێناوەتە دی کە دەستی تێ خستوون. بۆ نمونە: *ساڵی ١٩٧٠ کاتێک حکومەتی بەعس لەگەڵ مەلا مستەفا ڕێک ئەکەوێ و ئیشی بە جەلالی نامێنێت، جەلالی لە فۆرمی پچڕانەودا ئاشبەتاڵ ئەکات. *ساڵی ١٩٧٥ کاتێک ئێران لەگەڵ عێراق لە جەزائیر ڕێک ئەکەوێت، ئیتر ئیشی بە مەلایی نامێنێت و مەلایی لە فۆرمی بڵاوەپێکردندا ئاشبەتاڵ ئەکات. *ڕۆژی ٩١/٣/٢١ سەرکردەی حیزبەکان بۆ هێنانەوەی کێشەی جیهانیی کورد بۆ بەردەمی جەلادەکانی، بە تۆپەڵ ئەنێردرێنە بە غدادو لاچاوی سەددام ماچ ئەکەن. *بۆ لەباربردنی هەلێکی گەورەی مێژوویی مانگی ٥ی ٩٤ شەڕی ناوخۆ هەڵئەگیرسێنن. *بۆ کۆتایی پێهێنانی "ناوچەی پارێزراو" و دەرفەتی ڕزگاریی، ڕۆژی ٩٦/٨/٣١ پارتی لەوسەرەوە ئەچێ سوپای عێراق ئەهێنێتەوەو یەکێتی یش لەم سەرەوە کوردستان چۆڵ ئەکات. بەجوت دەست ئەنێنە بینی هەلەکەو حیزبە بچوکەکانیش لەناوکەڵیاندا قاچی ئەگرن. بەم پێیە ناوچەی پارێزاو ئەشکێنن و کێشەی کورد مانای سیاسی نامێنێت.

ڕوتێکردنە سیاسیەکان بە کشانەوە شکانەوە. سەرکردەی حیزبەکان گفتەکانی خۆیان نەبردە سەر. لەپشت خۆیانەوە چەندەها شەهیدو ماڵوێرانی و دەربەدەریی و ڕۆحشکاوییان بە جێ هێشت و لەبەردەمیشیانەوە تەنها ژمارەی دۆلاری بانق و دزو شرەخۆریان زیاد کردووە.

## بۆ کورد نابێت بە هیچ؟

وەڵام لای من ڕستەیەکە؛ چونکە کورد میللەتێکی بێ کۆنتراکتە. میللەتی بێ کۆنتراکت ئەو میللەتەیە کە کۆنتراکتێک نیە لە نێوانی هەردوو لایەنەکەدا؛ لایەنی دەسەڵاتدارو لایەنی خەڵک. دەسەڵاتدارەکانی خاوەنی بڕیاری موتڵەقن و میللەتەکەش بەندە بەو بڕیارانەوە ئەوان ئەیدەن. لەم واتاکردنەدا دوو زاراوە گرنگە ڕون بکرێتەوە؛ حوکمی موتڵەق، بەندبوون.

### ١- حوکمی موتڵەق

نیشانە-پیشانێکی حوکمی موتڵەقی سەرکردەکانی کورد ئەوەیە هەرچی ئەوان ئەیکەن بۆ میللەت و شۆڕش حسابەو، هەرچیش بکەوێتە دەرەوەی دەسەڵاتی ئەوان بە پێچەوانەی بەرژەوەندیی شۆڕش و میللەت لە قەڵەم ئەدرێت و، خۆیان وتەنی بمانەوێ و نەمانەوێ ئەکەوێتە بەرەی دوژمنەوە. ڕاستیی ئەوەی کە ئەم حوکمڕانییە لە دەرەوەی هەڵسەنگاندنە لەوەدا دەرئەکەوێت کە ئەوەی دەسەڵاتدارەکانی پێشتر خەڵکیان پێ تاوانبارو خوێن-حەڵاڵ کردووە، دواتر خۆیان بە زیادەوە لە هەمان شتیان کردووە بە بێ ئەوەی لەسەریان بکەوێت. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ئەم دەستەیە

**•میللەتێک لە ڕێگای مەرج لەسەر دەسەڵاتەوە پیشانی ئەدات میللەتێکە بۆ چی، بۆ سەربەخۆیی یان بۆ ژێردەستیی.**



**وێنەی ژ:٤. عێراق ساڵی ١٩٧٠ سکە لەژێر سەمەنەفەری جەلالی دەرئەهێنێ، مەلایی بەردەوام ئەبێت تا ئێسکەی ئێرانی ساڵی ١٩٧٥. ئەو کاتە هەردوکیان بە دوو شێوەی جیاواز لە یەک چارەنوسدا: *ئاشبەتاڵ" وەک یەک ئەوەستنەوە.***

خۆیان بڕیاری حەرام و حەلاڵ ئەدەن. بە زمانێکی تر، سەرچاوەی موراڵی سیاسی سەرکردەکانی کورد خۆیانن. ئەوان بڕیاری ئەوە ئەدەن ئەو ڕۆژە کام شت لە سیاسەتدا پۆزەتیڤە یان نێگەتیڤ. هەر وەکو چۆن کوتاڵفرۆشێک قوماشێک بە "مەترە" ئەپێوێت بۆ ئەوەی بزانێت بایی چەندە، ئاواش مرۆڤی کورد بەوەی سەرکردەکانی بۆی دیاری ئەکەن ئەبێت هەڵی سەنگێنێت کامانە باشن یان خراپ، حەرامن یان حەلاڵ. ئەوجا کاتێک بڕیاردەری پێوەرەکە خۆی، سوپای داگیرکەر ئەهێنێتە سەر کوردستان، جەردەیی و کوردکوژیی ئەکات، ئیتر سنوری نێوان سپی و ڕەش، باش و خراپ، جاش و پێشمەرگە نامێنێتەوە. ئەو کاتە کە ئێستا نمونەیەکێتی، خەڵکی کورد هەر ئەوەی بۆ ئەمێنێتەوە کە لەم پاشاگەردانیە هەڵ بێت. ئەم کوردستان چۆڵکردنە دیاردەیەکی بەچاوبینراوی ئەم ڕاستیەیە. بۆیە:

- **چارەسەر لەدەرەوەی حیزبەکانە**
- **مەسەلە ئەوەنیە حیزبەکان چی بکەن، ئەوەیە چۆن ئەو سیستێمی دەسەڵاتەی دەستەیەک حیزبی سۆندە پێکی هێناوە نەمێنێت!**

### ٢-بەندبوون

ئەو ڕێگاتیاچونەی میللەتەکەی لەسەرە "بەندبوون"ە. بەندبوون ئەوە پیشان ئەدات کە مرۆڤەکان مافی سیاسیان نیە، تەنها قەرزارباریان لەسەرە.

چۆن؟ تەماشای چەند نمونەیەک بکە:-

*خەڵکی کورد مافی ئەوەی نەبووە بڕیار بدات بەردەوامیی بدات بە بزووتنەوەکەی یان ئاشبەتاڵ بکات. بەڵام خەڵکی کورد قەرزاربار بووە بەوەی بەند بێت بەو بڕیارەوە کە مەلا مستەفا دای.

* مرۆڤی کورد مافی ئەوەی نەبووە بڕیار بدات کە ئایا ببێت بە لایەن لە جەنگی ئێران و عێراقدا یان خۆی لێ بپارێزێت. خەڵکی کورد بەند بووە بە بڕیاری سەرکردەی حیزبەکانەوە کە کردویەتی بە بەشێک لە سیاسەتی سەربازیی یەکێک لەو دەوڵەتانە.

*خەڵکی کورد مافی ئەوەی نەبووە بڕیار بدات چی لەم هەلە مێژووییەی بکات. کاتێک کە پەرلەمانێکیشیان بە میللەتەکە هەڵبژارد، ئەم پەرلەمانە هەر کڵاونانە سەری جەماوەرو سوککردنی دامودەزگای دیموکراتی بوو. دەنا لە هەموو کوردستانی باشوردا، بەشێوەیەکی سەرەکی، هەر دوو کەس بڕیار ئەدات ئەویش: **جەلال**

**•تەنها ئەوە بەس نیە خۆت بدەیت بە کوشت.**
**•ئازادیی، دیموکراتی، ڕزگاریی، ئەمانە هەمووی قسەی بەتاڵن لەناو کۆمەڵەگایەکی بێ کۆنتراکتدا.**

**تاڵەبانی و مەسعود بارزانیە.** شەڕ، ئاشتی، ئۆتۆنۆمی، فیدراڵی، ڕێککەوتن و جاشێتیی ئەمانە هەمووی دستەیەک بڕیاری لەسەر ئەدەن و خەڵکەکەش بەندە بەو بڕیارانەوە ئەوان فوی پیا ئەکەن. میللەتەکەش بەدەرێک چووە لە باشترین حاڵەتیا ئەوەیە کە چەپڵە لێ ئەدات. ئیتر گرنگ نیە چەپڵە بۆ چی لێ ئەدات؛ حکومەت یەتەوە یان حکومەت ئەڕوات، لە کوشتنی هەر باشترە.
*خەڵکی کورد مافی ئەوەی نیە چی لە تاوانبارێکی ئەنفال ئەکات، خەڵک قەرزارباره بەوەی بەند بێت بەوەوە کە جەلال تاڵەبانی مقەڕی لە کوردستان بۆ ئەکاتەوە.
*خەڵکی کوردستان مافی ئەوەی نیە بڕیار بدات حکومەت نەیەتەوە، بەڵام قەرزارباره بەوەی کە ئەبێت قبوڵی هێنانەوەی لە لایەن مەسعود بەرزانیەوە بکات.
"بەندیی" حاڵەتێکی تایبەتی نیە، نەبەستراوە بە نەخوێندەوارییەوە، نەژادێکی کولتورییە لە پێکهێنانی سیمای کۆمەڵگاو کەسایەتی تاکەکانیدا . نیشانەکانی هەر لەناو گروپێکی دیاریکراودا دەرناکەوێت، لە گوندییەکەوە تا نوسەرێکی شەهادەدار ئەتوانێت ئەم کارەکتەرەی لێ دەر بکەوێت. لە پەیوەندی بەندبوون دا ، تەنها دەسەڵاتدار حوکمی موتڵەقی خۆی ناگەیەنێت، بەندەپیاویش کەساسی و ڕۆحسەقەتیی خۆی پیشان ئەدات.
**پرسیار: بۆ مێژووەکە لەسەر سکەی بەندبوون ئەڕوات؟**
**وەڵام: چونکە مەرج سفرە**
بۆ باشتر تێگەشتن لە "مەرج" ئەم نمونەیە ئەهێنمەوە:
*تۆ سەد هەزار دینار ئەدەیت بە بەڵێندەرێک کە لەماوەی شەش مانگدا خانوی "س"ت بۆ دروست بکات. بەم مەرجانەی خوارەوە: هەر مانگێک دواکەوت هەزار دیناری لێ ئەشکێنیت. هەر لادانێک لەوەی ئەندازیارەکە بۆی دائەنێت، لەسەر حسابی بەڵێندەر خۆی ڕاست ئەکرێتەوە. هەتا ٥ ساڵ هەر هەڵەیەکی بینراو لە سترەکتوری خانوەکەدا ڕوی دا ، بێ فاکتۆری دەرەکی وەکو؛ لافاو، ئار.پی.جی بەڵێندەر ئەچێتە ژێر باری هەموو خەسارەیەکەوە کە پەیوەندی هەبێت بە خراپیی خانوەکەوە.*
پاش ئەوەی زانیمان "مەرج" چیە، ئێستا لەو باسە مێژووییەی پێشوو باسم کرد ئەم پارچەیە ئەخەینە بەردەممان:-
**لایەنی یەکەم: سەرکردەکان.**
**گفتی ژ١: گفتی پارتی.**
**لایەنی دووەم: میللەت.**
**ڕوتێکردنی سیاسی ژ١: بەدەست هات.**
مەرج: ؟؟
تەشقەڵەکە لەناو ئەو نەژادانەدایە کە پێکڕا سترەکتورێکی دینامیکیی جوڵانەوەکە پێک ئەهێنن. سەیرکە: سەرکردەکان وەکو لایەنی یەکەم چونە ژێر باری گفتی یەکەمەوە. بۆ بەدیهێنانی ئەم گفتە داواکارییان لە میللەت پشتگیریی بوو. میللەت وەکو لایەنی دووەم چووە ژێر باری داواکاریی سەرکردەکانەوە. سەرئەنجامی ئەمە ڕوتێکردنی سیاسی دروست بوو. بەڵام ئایا خەڵک وەکو لایەنی دووەم لەبەرامبەر ئەو قوربانی و خۆبەکوشتدانانەدا مەرجی چی بوو لەسەر سەرکردەکانی؟ ئەگەر سەرکردەکان گفتەکانی خۆیان نەبردە سەر خەڵکەکە هەقی ئەوە چی ئەکات؟
مێژووەکە ئەوە پیشان ئەدات کە؛ میللەتی کورد بێ مەرج خۆی خستۆتە ناو دەستی سەرکردەکانیەوە. ئەم بێمەرجییە وەکو ناوەڕۆکێک فۆرمێکی خۆی دەرئەدات کە حوکمی موتڵەقە. لە ژێر سایەی دەسەڵاتی ئەم حوکمەدا:
**میللەت:** ١- مافی سیاسی نیە، قەرزارباریی لەسەرە.
٢- بێ گەرەنتی خۆی بەخت ئەکات. واتە ئەو خەڵکە خۆی ئەدات بەکوشت، بەڵام هیچ زامنێک نیە کە ئەم قوربانیدانە بۆ کێیەو چی پێ ئەکرێت.
**دەسەڵاتدارەکان:** مافی بڕیاریان هەیە بەڵام قەرزارباریيان لەسەر نیە. واتە مافی ئەوەیان هەیە بڕیاری چارەنوسی میللەتەکە بدەن، بچنە ژێر گفتەوە، بەڵام قەرزاربار نین نە بەوەی کە ئەو بڕیارانە لە خزمەتی چی و کێدا ئەبن، نە بەوەی کە ئەو بڕیارانە دێنە دی یان نا؟

بێمەرجیی ئەوە پیشان ئەدات کە پەیوەندی نێوانی لایەنی دەسەڵاتدارو لایەنی خەڵک پەیوەندییەکی تەواوکەرانەیە، پەیوەندیی مافدارو قەرزاربار، زۆردارو زۆرلێکراو، شوان و مەڕ نەک پەیوەندی دوو لایەنی کۆنتراکت. واتە؛ "**پەیوەندی تەواوکەریی**" ئەوەیە کە لایەنەکەی تریش لە فۆرمێکی تردا درێژە ئەدات بە هەمان مەسەلەو ئەیخاتە هێڵێکی داخراوەوە. تۆ ئەگەر مەڕ نەبیت شوانیشت نابێت. ئەم سۆبستانسانە کارخانەیەکی کولتورییان دروست کردووە کە بەرهەمەکەی ئەوەیە: سەرکردەکان هەموو شتێکیان بۆ ئەلوێ و میللەتیش هەموو شتێکی بەسەردا تێ ئەپەڕێت.
دڵ حساب نیە. میللەتێک بۆ ڕزگاریی مەرجی دانەنابێت لەسەر سەرکردەکانی، هیچ شتێک پیشانی نادات کە لە ناوەڕۆکدا ئەو میللەتە میللەتێکە بۆ ڕزگاریی نەک بۆ ژێردەستیی. کورد ئەمڕۆ ئەو مەرجانە پڕ ناکاتەوە کە سەربەخۆبوونی هەیەتی لەسەری*

**دیاکنۆس**
**نەخۆشیی: کورد، میللەتێکی بێ کۆنتراکت.**
**ڕەچەتە: کۆنتراکت تیۆریی.**
**کۆنتراکت تیۆریی چیە؟**
*وەڵام: ژمارەی داهاتوو!*

# ئەو بازرگانییەی کە گشت لایەک قازانجی لێ دەکرد

- لۆری، یان بۆری نەوتی تایەلێبەستراو!
- تەماع زیان بە کوردەکان ئەگەیەنێت
- قاچاغی سەرسنور سودی تیایە بۆ هەموو

گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە:
هێمن



وێنەی ڕیزێک لۆری، سنوری تورکیا-عێراق،ساڵی ١٩٩٥.

بە تەخمینی ئەو پسپۆڕانەی کە لە نزیکەوە ئاگایان لە هاتوچۆی سەر سنور هەیە، لە ساڵی ١٩٩٤دا ڕۆژی چل ملیۆن گاڵۆن گازۆیلی عێراقی بە کوردستانی عێراقدا دەنێررا بۆ تورکیا. ئەم بازرگانییە سەرلەنوێ بوژاوەیەی گازی عێراقی، لە نێوان عێراقییەکان و تورکەکان و کوردەکاندا مەسەلەی مونافەسەی پارەو جیوپۆلیتیکە لەو ناوچە کوردییەی سەروی عێراقدا. ئەو بازرگانییە لە لایەکەوە کەمدەستەلاتیی ئەو ئابلوقەیە دەرئەخات کە لیژنەی ئاسایی نەتەوە یەککگرتووەکان بەسەر سەدام حوسێندا سەپاندوویەتی و لە لایەکی دیکەوە ئەوە دەستنیشان ئەکات کە تەماع چەند زیان بە کوردەکانی عێراق ئەگەیەنێت. کابرایەکی ئەمریکی کە لە کوردستان کاری دەکرد، لەسەر سنوری تورکیا/کوردستاندا تەماشای لۆریەکانی سەر سنوری دەکردو ووتی: *"ئەو لۆرییانەی نەوت لە عێراقەوە بە کوردستاندا دەبەن بۆ تورکیا، بۆری نەوتی تایە لێبەستراون و عێراق لە بری بۆری ئاسایی نەوتەکەیان پێ دەنێرێتە دەرەوە. کوردەکان ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینین لەم کارەدا."* سەرەڕای ناڕەزایی ئەمەریکا، ئەو بازرگانییە لە ساڵی ١٩٩٢ەوە بەردەوامە(١). لە ساڵی ١٩٩٤دا ئەو بازرگانییە گەیشتە لوتکەی چالاکییەکانی تا لە ساڵی ١٩٩٥دا بە فەرمانی ئەمەریکا، تورکیا میقداری گازۆیلەکەی کەم کردەوە و ڕێگای نەدا بە لۆرییەکان یەکی لە ٧٥٠گاڵۆن زیاتر لە عێراقەوە بهێنن. پێش ئەو بڕیارە هەر لۆرییەک

ده ئەوەندە گازۆیلی ئاودیوی سنور ئەکرد. تورکیا ڕێگای ئەو بازرگانییە ئەدات چونکە زۆربەی پارەی ئەو بازرگانییە دەچێتە خواروی ڕۆژهەلاتی تورکیا(کوردستان-وەرگێڕ) و لە ڕوی ئابورییەوە دەبوژێتەوە. ئەم کارە دەنگی نارەزایی و جیابونەوە لە نێو کوردەکاندا کەمدەکاتەوە. بە گوێرەی سەفارەتە ڕۆژئاواییەکان لە تورکیا، شەست هەزار سایەقلۆری تورکیا ئەو بازرگانییەیان بەڕێوە دەبرد.

**٦٠هەزار سایەقی لۆری، هەر سایەقەو نزیکەی ١٠ هەزار دۆلار لە سەفەرێکدا قازانج ئەکات.**

هەندێک جار، پێنج هەزار لۆری (دە هەزار سایەق) بە درێژایی زیاتر لە سی کیلۆمەتر ڕیزیان دەگرت بۆ ئەوەی بچنە ناو عێراق بۆ گازۆیل هێنان. نزیکەی شەشسەد هەزار کەس (سایەق و خێزانەکانیان) لەسەر ئەو بازرگانییەی سەر سنور دەژیان.(٢)

ئەو بازرگانییە قازانجێکی زۆری بۆ عێراقیش هەبوو، بۆیە عێراقیش ڕێگای بۆ خۆش کردبوو. لۆریەکان ئاردو شەکرو شتی دیکەیان دەبرد بۆ عێراق. هەر تەنێک ئارد کە لە تورکیاوە دەیان هێنا، هەر لۆریەک بۆی هەبوو ١٥٦٠ گالۆن گازۆیل لە عێراق بکڕێت. سایەقەکان گالۆنێک گازۆیلیان بە ١٥سێنت (٤بۆ ٦دینار) لە عێراق ئەکڕی و لە تورکیا بە دەقات دەیان فرۆشتەوە. لە هەر سەفەرێکدا یەکی نزیکەی دە هەزار دۆلاریان قازانج دەکرد.

تەنانەت کاتێک تورکیا میقداری گازۆیلی بۆ لۆرییەکان کەم کردەوە، لە هەر سەفەرێکدا سایەقەکان یەکی ٥٠٠ دۆلاریان قازانج دەکرد.

لێپرسراوە ڕۆژئاواییەکان هەموو دەیانزانی کە عێراق لە لایەکەوە هێندێک لە نەوتەکەی بەو شێوەیە دەفرۆشێت و پارەی دەست دەکەوێت و لە لایەکی ترەوە ئازوقەی لە تورکیاوە بۆ دەهات. بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوە بو کە ڕژێمی سەددام کونێکی گەورەی کردبووە ئەو دیواری ئابلوقە ئابورییەی کە نەتەوە یەکگرتوەکان بەدەوری عێراقدا دروستی کرد بوو.

کوردەکانیش ڕێگا بەم بازرگانیە دەدەن چونکە داهاتێکی ئێجگار زۆریان لەو باجە دەست دەکەوێت کە دەیخەنە سەر ئەو بازرگانییە. پارێزگاری دهۆک (عەبدول عەزیز تەیب) دەڵێ: *"ئاشکرایە کە عێرا ق و ئێمە سود لەم بازرگانیە دەبینین. ئەو باجەی کە پەرلەمانی کوردی خستویەتە سەر بازرگانی گازۆیل تەنیا شتە کە دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی پەرلەمانی کوردی بە پێوە ڕاگرتووە"*. بە قسەی لێپرسراوی سەفارەتە ڕۆژئاواییەکان داهاتی باجی ڕۆژانەی ئەو بازرگانییەی سەر سنوور لە ساڵی ١٩٩٤دا سەد هەزار دۆلار بوو. ئەو باجە لە ماوەی دوو مانگ و شتێکی ساڵی ١٩٩٤دا گەیشتە چوار ملیۆن دۆلار و نیو*

**تێبینی و پەراوێز:**

(١) بە پێی ئەو کوردانەی کە تا کۆتایی ١٩٩٦ بەو ناوچەیەدا تێ پەڕیبوون، تا ئەو کاتەی ڕێگا درا بە عێراق بەشێک لە نەوتەکەی بنێرێتە دەرەوە، لۆری تورکیی لەسەر سنوور ڕیزیان بەستبوو بۆ ئەوەی بچنە عێراق بۆ گازۆیل هێنان.

(٢) ئەمە سەرەڕای ئەو داهاتەی کە سایەقی تەکسیەکانی تورکیا دەستیان دەکەوت لەوسێ چوار هەزار (بە پێی تەخمینێکی زۆر سەرپێیی)کوردەی کە ساڵانە لە ئەوروپاوە دەگەڕێنەو بۆ کوردستان.

#دەقی ئەم وتارە لە ژێر ناونیشانی(قاچاغی سەرسنوری عێراق و تورکیا سود بە هەمولایەنەکان دەگەیەنێت)لە ژمارە(٨ . ٩،ئەپریلی ١٩٩٥)ی ڕۆژنامەی(International Herald Tribune)دا بڵاوکراوەتەوە.

## *سەرانی پارتی* ڕۆژی ملیۆنێک دۆلار دەدزن، ڕۆژی ٣٢٠هەزار دۆلار لە پارەی ئیبراهیم خەلیل ئەدەن بە عودەی تکریتیی



ئەوەی سەرەوە کورتکراوەی ناونیشانی وتارێکە لە بڵاوکراوەی **"هەتاو"**ی ژمارە ١٥و١٦ی ١٩٩٧دا. بە پێی ئەو وتارە کە دەستی ڕاکێشاوە بۆ هەندێک سەرچاوە، "پارتی" ڕۆژانە ٨ملیۆن لیتر نەوت لە وەزارەتی نەوتی عێراقی بە (١.٥) سنت دەکڕێ و دەیفرۆشێتەوە بە شۆفێری شاحینەکان بە ١١.٥سنت. پارتی ڕۆژی ٨ملیۆن لیتر سووتەمەنی لە نەوت و بەنزین دەفرۆشێ و لەمەش ڕۆژی ٨٠٠هەزار دۆلاریان دەست ئەکەوێت. (٤٠٪)ی ئەم دەسکەوتەش کە دەکاتە ٣٢٠هەزار دۆلار ئەدرێ بە عودەی کوڕی سەددام حوسەین. پارتی جگە لەمە لە ڕێگای ڕەسم سەندن و قاچاخ و بازرگانیی ترەوە سەرجەمی دەسکەوتی ڕۆژانەی بە یەک ملیۆن دۆلار قەبڵاوە. بە پێی **"هەتاو"** کە دەستی بۆ چاودێرانی ئاگادار ڕاکێشاوە، پارەی تایبەتی بنەماڵەی بارزانی لە بانقەکانی ئەوروپادا بە بلوێن تا بلوێن و نیوێک دادەنێن*

# هەندێک راستی دەربارەی زۆنەکە

**هێمن**

**•مانگی ٥ی ١٩٩١، ٢٢٠٠٠کەس، لە ١٢ ولاتی دنیاوە، ڕۆژی ٥٠٠ ٠٠٠ کەسیان لە کوردستاندا تێر ئەکرد.**

**•هەر شەش مانگەو (١٣٪)ی پارەی نەوت بە ئازووقەو دەرمان، کە ئەکاتە ٢٦٠ملیۆن دۆلار، بۆ کورد سەرف ئەکرێت.**

**•پاکسازیی حیزبەکوردیەکان ١٠٠٠٠کەسی گرتۆتەوە.**

**•ئێریک فالت ئەڵێ دابەشکردنی ئازووقەو داودەرمان لەو ناوچانەدا زەحمەت بووەو بە زۆری ژن و مناڵ و پیری تیا چووە.**

لە ڕۆژی ١٩٩١/٤/٥دا پرۆژەی دابینکردنی جێوڕێ (Operation Provide Comfort) بە فەرمانی سەرۆکی ئەو کاتەی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا "جۆرج بوش" دەستی پێ کرد.
ئامانجی سەرەکی ئەم پرۆژەیە دابینکردنی یارمەتی ئینسانی بوو بۆ ئەو (٥ . ١-٢) ملیۆن پەنابەرە کوردەی کە پاش شەڕی کەنداو لەدەست ڕژێمی عێراقی هەڵ هاتبوون بۆ تورکیاو ئێران و چیاکانی کوردستان. لە (١٩٩١/٤/٢٢)دا بنکەیەکی سوپایی (MCC) لە زاخۆ و یەکێکیش لە "پیرینجلیک" لە تورکیا دروست کران. ئەرکی ئەم بنکانە ئەوە بوو کە چاودێریی سەرووی عێراق بکەن و نە هێڵن ڕژێمی عێراقی ئەو یارمەتییە ئینسانییە تێک بدات. لە (١٩٩١/٥/١٣)دا لێپرسراوی نەتەوە یەککگرتوەکان دەستی بەسەر کارەکاندا گرت و پەنابەرەکان وورده وورده گەڕانەوە بۆ ئەو کامپانەی کە نەتەوە یەککگرتووەکان دروستی کردبوون. لە مانگی شەشی هەمان ساڵدا زۆربەی پەنابەرەکان لە تورکیاوە گەڕانەوە بۆ کوردستان.
لە مانگی پێنجی ١٩٩١دا (١٢٠٠٠) کەس لە سوپای وولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا یارمەتییەکانی سەرووی عێراقییان بە ڕێوە دەبرد. بە تێکڕا (٢٢٠٠٠)کەس کە لە دوانزە وولاتەوە: ئوستراليا، بەلجیکا، بەریتانیا، کەنەدا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتالیا، لوکسومبورک، هۆڵەندا، پورتوغال، ئیسپانیا و ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا. بایی (٢٥)ملیۆن پاوەندیان خواردن دابەش دەکرد و ڕۆژی نیو ملیۆن پەنابەریان تێر دەکرد.
لە ١٩٩١/٧/١٥دا قۆناغی یەکەم لە پرۆژەی دابینکردنی جێوڕێ (OPC) کۆتایی پێ هات. هێزە هاوپەیمانەکان عێراقیان جێ هێشت و ناوچەیەکی پارێزراویان لە سەرووی عێراق (لە سەرووی هێڵی پانی ٣٦) دروست کرد کە پۆلیسی نهێنی و سەربازی عێراقی بۆیان نەبوو بچنە ناوی بەڵام ڕێی خۆش کرد بۆ زۆربەی پەنابەرەکان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە جێوڕێی خۆیان. ئەو کاتە قۆناغی دووەمی چالاکییەکان دەستی پێ کرد.
پرۆژەی دابینکردنی جێوڕێ پێک هاتووە لە هێزێکی (١٦٠٠) کەسیی لە چوار ولاتی هاوپەیمانەوە: ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا، تورکیا، فەرەنسا، بەریتانیا. کاری ئەم هێزە ئەوەیە کە بڕیاری ٦٨٨ی نەتەوە یەککگرتوەکان پیادە بکەن. لە بنکەی ئینجلی تورکیاوە فرۆکەکانی ئەو هێزە بۆ چاودێریکردن و پاراستنی ئەو زۆنە دەچونە عێراق. ئەو هێزە هاوپەیمانە بوونی خۆی لە ئاسمان و زەویدا پیشان دەدا بۆ ئەوەی ڕێ لە هێزیی سوپایی عێراقیی بگرێت کە بچنە ئەو ناوچە ئازادکراوەو دانیشتوانی سەرووی عێراق لە دەستدرێژیی ڕژێمی عێراقیی بپارێزن. لە (١٩٩١/٥/٤)ەوە تا مانگی شەشی ١٩٩٦، پەنجا فرۆکەی ئەو چوار دەوڵەتە (٥٦٥٠٠) جەولەی ئیستیتلاعییان لە سەرووی عێراقدا کرد. هەر لەو ماوەیەدا بایی (٢٤) ملیۆن دۆلار خواردن و شتی پێویست بۆ خەڵکی سەرووی عێراق نێردراوە. خەرجی ئەو هێزە چواردەوڵەتییە لە ساڵی (١٩٩٥)دا (٨ . ١٠٤) ملوێن دۆلار بوو. لە کاتی دروست بونی زۆنەکەوە تا مانگی چواری ١٩٩٥ خەرجی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ یارمەتیدانی پرۆژەی دابیکردنی جێوڕێ لەسەرووی عێراق گەیشتبووە (٨٦٠) ملیۆن دۆلار. تا مانگی شەشی ١٩٩٦، ئەنجومەنی میللی باڵای تورکیا (١٠) جار دەنگی دابوو بۆ بەردەوامبوونی چالاکییەکانی پرۆژەی دابینکردنی جێوڕێ. لەمانگی هەشتی ساڵی (١٩٩٦)دا (١٦٣٨)کەس لە چوار دەوڵەتەوە ئەو پرۆژەیەیان بەڕێوە دەبرد. (١١٧٧)کەس لەو ژن و پیاوانە لە هێزی ئاسمانیدا کاریان دەکرد. ئەمڕۆ (٢٠٠) فەرمانبەری نەتەوە یەککگرتووەکان لە کوردستاندا کار دەکەن و (٤٠٠) کەسی کورد یارمەتیان دەدەن بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان.
لەو کاتەوەی کە ڕێککەوتنی (نەوت-بۆ-خواردن) لەگەڵ عێراقدا بەستراوە، هەر شەش مانگ جارێک بایی دوو ملیارد دۆلار نەوتی عێراق دەفرۆشرێت بۆ ئەوەی بدرێت بە ئازووقە بۆ خەڵکی عێراق لەو دوو ملیارد دۆلارە، (٢٦٠) ملیۆن دۆلار (واتە ١٣٪) تەرخان کراوە بۆ یارمەتی ئینسانیی (ئازووقەو داودەرمان) بۆ کوردەکان. لیژنەی خواردەمەنی و کشتوکاڵی نەتەوە یەککگرتووەکان، تا مانگی دەی ئەمساڵ (٢٨٠٠٠٠) تەن ئازووقەی لە ڕێی (١٠٣٠٠) بایعەوە بەسەر خەڵکی کوردستاندا دابەش کردووە.

سەرەڕای ئەو بارودۆخە لەقەی ناوچەکە، لیژنەی تەندروستیی جیهانیی (WHO) دەستی کردووە بە دابەشکردنی پێویستیی پزیشکیی لە ناوچەکەدا و کۆتانی دژی (پۆلیۆ) دەستی پێکردووە. لیژنەی خواردن و کشتوکاڵیش (FAO) خەریکی حەملەیەکی سەرتاسەرییە بۆ کوتانی مەڕومالآت لە ناوچەی دهۆک و هەولێر. **ئێریک ڤالْت** (Erik Falt) قسەکەری نەتەوە یەککگرتووەکان دەربارەی کاروباری عێراق بە ڕۆیتەر دەڵێت: "سەرۆکی هەر دوو ئەو ڕێکخراوە کوردییەی کە دەیانەوێت دەسەڵاتی تەواویان بەسەر کوردستاندا هەبێت، بەڵێنیان داوە کە هیچ کۆسپێک نەخەنە بەر دابەشکردنی ئازووقە لە ناوچەکەدا." بەڵام لە هەمان کاتدا لێپرسراوی نەتەوە یەککگرتووەکان لە بەغداد دەڵێت کە لە ئەنجامی شەڕی ئەم دواییەی نێوان کوردەکان و چوونی تورکیا بۆ ناوچەکە، ئازووقەو پێویستیی پزیشکیی نەتوانراوە بگەیەنرێتە هێندێک ناوچە. لە چواری مانگی (١١)ی ئەمساڵدا، ئێریک فاڵت بە ڕۆیتەری ووت: "سەرەڕای گەرەنتی سەرۆکی یەکێتی و پارتی، بەڵگەمان بە دەستەوەیە کە لەم دوو هەفتەیەی دواییدا (١٠٠٠٠) کەس لە شوێنی خۆیان ڕاگوێزراون و دابەشکردنی ئازووقە و داودەرمان لە ناوچەکەدا بەو هۆیەوە گەلێک گران بووە." ئێریک فاڵت لە دواییدا دەڵێت: "ئەم سیاسەتی ڕاگوێزانە وەک سیاسەتی پاککردنەوە (Cleansing) وایەو بە زۆریی ژن و منداڵ و پیری گرتۆتەوە" ئاشکرایە وڵاتە هاوپەیمانەکان بەرژەوەندی تایبەتیان هەبوو لە دروستکردن و پارێزگارییکردنی ئەو زۆنە، هەر لەبەرئەوەش بوو ساڵی چەند سەد ملوێنێک دۆلاریان لێ سەرف دەکرد و سەربازو خەڵکی خۆیان لەوێ دانا بوو بۆ سەرپەرشتی کردنی کارەکان. بەرژەوەندییەکانی وڵاتە هاوپەیمانەکان هەرچییەک بوبێت، دروستکردنی ئەو زۆنە لەزۆر لایەنەوە قازانجی بە بەرژەوەندی کوردەکانی دانیشتووی ئەو زۆنە بە تایبەتی و مەسەلەی کورد بە گشتی دەگەیاند. دروستکردنی ئەم زۆنە، جگە لە عێراق و تورکیا و ئێران، لە لایەن زۆر ولاتانی دیکەشەوە، بە تایبەتی وڵاتە عەرەبییەکان، دژایەتی دەکرا. ئاشکرایە ئەو بەرژەوەندییەی وڵاتە هاوپەیمانەکان لە دروستکردنی ئەو زۆنە هەیان بوو، دەبێت زۆر گرنگ بوو بێت کە وا بکات گوێ بە ناڕەزایی ئێران و عێراق و سوریاو گەلێک وڵاتی دیکە نەدەن و تەنانەت قەناعەت بە تورکیاش بکەن کەلە بنکەی پیرینجلیکی تورکیەوە چاودێری زۆنەکە بکەن. ئەوەی لەسەر کورد خۆی چاوەڕوانکراو بوو وە ئێستاش زۆر پێویستە ئەوەیە کارێکی وا بکات بۆ جیهانی پیشان بدات کە لەو زۆنەدا مافی خەڵکی کورد دەپارێزرێت وە بۆ وڵاتە هاو پەیمانەکانیشی بسەلمێنێت کە بەرژەوەندیەکانیان لەو زۆنەدا ناکەوێتە مەترسییەوە.




مانەوەی ئەو زۆنە بەستراوە بە زۆر لایەنەوە لە بەرژەوەندیی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکاوە بگرە تا بەرژەوەندی وڵاتەکانی ناوچەکە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە مانەوەی زۆنەکە لە بەرژەوەندی مەسەلەی کوردە، چونکە مەسەلەی کورد لە ئاستی جیهانییدا دەهێڵێتەوەو نەمانی زۆنەکە زیانێکی ئێجگار گەورەی پێ دەگەیەنێت. بەڵام ئایا پارت و ڕێکخراوە کوردییەکان لەو ڕوانگەیەوە تەماشای مەسەلەکە ئەکەن؟*

-٢-١١/١٩٩٧



# "ئەنفال" و "ڕۆژی حەشر"

ئالان حەمە
١٩٩٧،٨

لە مانگی ٧ی ١٩٨٣دا، هێزی پ.د.ک لە پێش هێزەکانی ئێرانەوە "حاجی هۆمەران" کە شوێنێکی ستراتیجی ئەبێت، بە هاوبەشیی ئەگرن. بەشداربونی هێزەکانی پ.د.ک لە گەڵ هێزەکانی ئێراندا زۆر لەوەو پێشتر بووە. لە ١٩٨٥/٢ گفتوگۆی ی.ن.ک لە گەڵ میریدا تێک دەچێت. ی.ن.ک پەیوەندی لە گەڵ ئێراندا بە هێزتر دەکات و لە هەمان کاتدا ئێران دەوری ناوبژیکەر دەبینێت بۆ وەلاخستنی شەڕی نێو خۆی هەر دوو هێزەکە؛ پ.د.ک و ی.ن.ک. تا لە ١٩٨٦/١٠دا ڕێکەوتنی مەیدانی ئەبەستن بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی عێراقی. هێزی پڕچەکی پاسدار بە هاوبەشی هێزی پێشمەرگە دەست دەکەن بە عەمەلیاتی سەربازی دژی حکومەتی عێراق، بەتایبەتی لە ناوچەکانی

The Anfal Campaigns: February - September, 1988



# هەزارەها لاشە کە بەچەکی کیمیاوی کوژرابون لە لایەن لەشکری عێراقەوە سوتێنران

کەرکوک، قەراخ...

## لەناوبردنی ٨٠٠٠ بەرزانی

سەعات ٢ی شەوی ١٩٨٣/٩/٣٠ شەوێکی نائاسایی دەبێ بۆ کۆمەڵگا زۆرەملیەکەی" قوشتەپە". سەربازی عیراقی ٨٠٠٠ پیاو لە بارزانیەکان لە سەرو ١٣ ساڵانەوە کۆدەکەنەوەو لە تۆڵەی گرتنی حاجی هۆمەران دا دەیانبەن.

سەدام حسێن لە تەلەفیزۆنی عێراقیدا دەربارەی بارزانیەکان دەڵێت" ئەوانە خیانەتیان لە نیشتیمان و هەموو دابی کۆمەڵایەتی کرد، ئێمەش ناردمانن بۆ جەهەننەم". بە کۆمەڵ کوشتنی بارزانیەکان مژدەیەکی ناخۆشی تاوانێکی گەلێک لەوە مەزنترە کە لە ساڵی ١٩٨٨ دەست پێ دەکات: *ئەنفالەکان.*

## ئەنفال

وشەیەکی عەرەبیە، ناوی سورەتی "٨"ە لەقورئان و manای "تالانی جەنگ"ە. ئایەتەکە لە دوای سەرکەوتنی موسوڵمانەکان بە سەر کافرەکاندا لە شەڕی"بەدر"دا هاتۆتە خوارێ. لە مێژووی نەتەوەی کورددا لە (٢٣ /١٩٨٨/١٢) ەوە دوای ١٣٦٠ ساڵ، ئەنفال مانایەکی تری هەیە.

ئەنفال ناوی کۆدی جەنگی زنجیرەک هێرشی سەربازیە کە حکومەتی عێراقی کردی دژ بە کورد بە مەبەستی تێکشاندنی نەتەوەیی، خاپورکردنی هەمو خاکی کوردوستان، ڕاگواستنی ١.٥ ملیون کورد، بەکۆمەڵ کوشتنی زۆربەی خەڵکی ناوچەکان.

ڕۆژی ١٩٨٧/٣/١٨ سەرۆک کۆمار سەددام حسێن و؛ شورای سەرکردایەتی شۆڕش؛ بۆ حەلکردنی مەسەلەی کورد بۆ هەتاهەتایە، عەلی حەسەن مەجید دەکەن بە سکرتێری گشتی حیزبی بەعس لە باکور. لە گەڵ دانانی عەلی حەسەن مەجید لەو جێگایەدا، هەموو دەسەڵاتی سەربازی و مەدەنی راستەوخۆ دەخرێتە ژێر دەستیەوە. ناوبراو نزیکەی ساڵێک تەرخان دەکات بۆ خۆئامادەکردن، لەمەشدا فیرقەی "١ و ٢"، هەموو هێزەکانی چەکداری ئەمن، جاش و مەدەنی بۆ ئامادەکردنی "هێرشەکانی ئەنفال" بەکار دەهێنێت. کوردستان وەک ناوچەیەکی جەنگی و قەدەغەکراو تەماشا دەکرێت.

## کۆبونەوەکان

عەلی حسەن مەجید لە یەکێ لە کۆبونەوەکانیدا لە کەرکوک دەڵێت: "ئێمە چیمان لێیان دەست کەوت؟" بە هەمان نابەدڵی لە قسەکردندا بەردەوام دەبێت: "وتم لەوانەیە چەند پیاوێکی باشیان تیا بدۆزینەوە. .بەڵام هەرگیز نەماندۆزیەوە، هەرگیز. ئەبێت سەریان پان کەمەوە، ئەم سەگانە ئەبێت سەریان پان کەمەوە. بەخێویان بکەم؟ ها! نا، ئەبێت بە بیلدۆزەر بیان نێژم.

## بڕیارەکان:

ساڵڕۆژ: ١٩٨٧/٦/٣

بڕیاری ژمارە [٢٨/٣٦٥٠]، خاڵی (٤):

**هێزە چەکدارەکان بە دەسەڵاتی یاساییانەوە ئەبێت هەر کەسێک یاخود هەر ئاژەڵێک لە ناوچەکاندا هەیە بی کوژن. ئەو ناوچانە بە هەموو شێوەیەک قەدەغەن.**

ساڵڕۆژ: ٢٠ / ٦ / ١٩٨٧

خاڵی(٤):

**سەرکردەی هێزە سەربازییەکان بە هەلیکۆپتەرو هێزی هەوایی کوێرانە شەو و ڕۆژ بە بەردەوامیی ناوچەکان بۆ کوشتنی زۆرترین ژمارەی خەڵک لە ناوچەکەدا، بۆمباران ئەکەن و ئاگاداریی ئەنجامەکانمان ئەکەنەوە.**

خاڵی(٥-٦):

**هەر کەسێک لەو گوندانەدا ئەگیرێت یاخود خۆی تەسلیم ئەکاتەوە، زیندان ئەکرێت و هێزەکانی ئەمن لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا ئەکەن. گیراوەکان لە سێ ڕۆژ زیاتر گل نادرێنەوە، لە کاتی پێویستدا دە ڕۆژ مانەوەیان درێژ ئەکرێتەوە، ئەوانەی تەمەنیان لە ١٥-٧٠ ساڵە دوای ئەوەی هەموو زانیارییەکی بەکەڵکیان لێ وەر ئەگیرێت ئیعدام ئەکرێن.**

## ئەنفالەکان

ژمارەی ئەنفالەکان هەشتە. ژمارەی هەشتەمیان بە دوا ئەنفال ناوبراوە. ئەگەر سەیری نەخشەی کوردستان بکەین شارە گەورەکان نەبێت هەموو ناوچەی کوردستانی بەشێوەیەکی زنجیرەیی گرتۆتەوە.

### ئەنفالی یەک. ناوچەی: سەرگەڵوو بەرگەڵوو

سەعات دووی شەوی ٨٨/٢/٢٣ خەڵکی گوندی یاخسەمەر (بارەگای سەرکردایەتی ی.ن.ک)، سەرگەڵو، بەرگەڵو لە ناڵەو کرمەی ڕاجیمەو بۆمبی لەشکری عێراقی بەخەبەربوونەوە، بە درێژایی ٤٠ میل تەوقی ناوچەکە ئەدەن، لە قوڵایی دوکانەوە؛ بنگرد، لەوێشەوە بۆ ناوچەی سلێمانی و ماوەت و چوارتا.

٣/١٨ واتە دوای ٥ ڕۆژ، هێزە سەربازییەکان هێرش دەبەنە سەر سەرگەڵو و بەرگەڵو. ژمارەی ٢٠٠-٢٥٠ پ.م شەهید دەبن. ٣/١٩ سەرۆک کۆمار سەددام حوسەین سەرۆکی گشتی هێزەکانی عێراق، بانگەوازی دا بۆ گەلی عێراق و پیرۆزبایی و ستایشی ئەو هێزانەی کرد کە بەشداریی هێرشەکانیان کردوە، بە تایبەتی هێزەکانی "بەدر" ئەمەش یەکەم جار بوو کە حکومەت بە ڕەسمی لە ئاژانسەکانی خۆیدا ناوی ئەنفال بهێنێت.

### ئەنفالی دوو. ناوچەی: قەرەداخ

لە ڕۆژی (٣/٢٢)ەوە دەست پێ دەکات تا(٨٨/٤/١).

**ئەنفالی٣**

# بەپێی "میدل ئیست وۆچ"ە پرۆسەی ئەنفالکردن بە موو لە بەکۆمەڵکوشتنی جولەکەکان جیاوازیی نیە.
# پرۆسەکە ٣ هەنگاوە: دیاریکردن، کۆکردنەوە، لەناوبردن.




دوای قەرەداغ سەرە دێتە سەر ناوچەی گەرمیان. لە (٤/٧)ەوە دەست پێ دەکات تا(٨٨/٤/٢٠). گەرمیان، ناوچەی نێوان سنوری قەراخ، جادەی چەمچەماڵ–کەرکوک، تۆزاوە–کەرکوک تا شاری کەلار و کفری و پێباز دەگرێتەوە. لە هەموو ناوچەکانی تر زیاتر ژن و منالی تیادا چوو.

**ئەنفالی٤**

لە (٥/٣)ەوە دەست پێ ئەکات تا (٨٨/٥/٨). ناوچەی ئاوی دوکان و ناوچەی نێوان هەولێرو کەرکوک دەگرێتەوە.

**ئەنفالی(٧،٦،٥)**

لە (٥/١٥)ەوە دەست پێ دەکات تا (٨٨/٨/٢٦). ئەم ٣ ئەنفالە ئەم ناوچانە ئەگرنەوە: شەقڵاوە، ڕەواندز، بالیسان (مەڵبەندی ٣ی یەکێتی)، ئاکۆیان، وەرتێ، خەلیفان، ڕانیەو هیران.
ڕۆژی ٢٦–٢٧ ئەو پ.م مانەی مابونەوە بنکەی مەڵبەندی بالیسان بە دینامیت ئەتەقیننەوەو ی.ن.ک وەکو هێزێکی شەڕکەر تەواو ئەبێت. ٨/٢٨ هێزی عێراق ئەچێتە ناو دۆڵی بالیسانەوە.

**ئەنفالی٨**

دوا ئەنفال ناوچەی بادینانە، ناوچەی هێزەکانی پ.د.ک. لە (٢٥/ ٨)ەوە تا (٨٨/٩/٦) ئەخاێنێت. سوپای عێراقیی بە (٢٠٠،٠٠٠)

**کەنعان مەکیە بەهاری ١٩٩٢، لە قوڕەتو ئەنوسێت:**

**"پادگانێکی گەورەی سۆڤیەت-دروستکراوی ڕوخاو، چەند شەروالێکی کاڵبوەوەو دڕاو، لێکەڵاوی قوڕو پیسیی بوبوون، بەعەرەبانەی تراکتۆرەکاندا هەڵ واسرابوون. تاکە پاتەو نەعلی پلاستیک لێرەو لەوێ کەوتبوون، چەند قوتویەکی بەتاڵ، ئەمە تەنها پاشماوەیەک بوو لە دەهەزارەها کورد کە لەم شوێنەوە لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە بەرێ کران بۆ بیابانەکان.**




سەربازەوە، بە هەموو جۆرە چەکێکی قورسەوە، لە گەڵ بەکارهێنانی چەکی کیمیاویدا ناوچەکە خاپور دەکەن. ١٢٣٩٥کەس بەر ئەنفال ئەکەوون. ١٥٧٤ پ.م، ١٤٨٩ پیاو، ٢٣٦٨ ژن و ٦٩٦٨ منداڵ.

هەزارەها لاشە کە بەچەکی کیمیاوی کوژرابوون لە لایەن لەشکری عێراقەوە سوتێنران. ٦٠-٨٠ هەزار کەس هەڵ هاتن بۆ ناو تورکیا.

## پرۆسێسی ئەنفال

لە ڕاپەڕینەکەی بەهاری ١٩٩١دا چوار ملیون پەڕە یان(١٤تەن) بەڵگەنامە لە بارەگاکانی حکومەتدا گیرا. لە ١٩٩٢/٥دا ی.ن.ک ئەو بەڵگانەی دا بە "میدڵ ئیست ۆچ" (**Middle East Watch**). ٣٥٠ کەس کە لەناو ڕوداوەکانی ئەنفالدا بوون دەرچون. "میدڵ ئیست" دوای دوو ساڵ لێکۆڵینەوە لەو چوار ملیۆن بەڵگەنامەیەو چاوپێکەوتنی ئەو٣٥٠کەسە، ئەنجامی کارەکەیان لە کتێبێکی ٣٧٠ لاپەڕەییدا، لەژێر ناوی: "جینۆسساید لە عێراقدا-کەمپانیەکانی ئەنفال دژی کورد"دا پوختە کرد. دڵۆپێک لە دەریایەک. بەپێی "میدل ئیست ۆچ" پرۆسەی ئەنفالکردن بە موو لە بەکۆمەڵکوشتنی جولەکەکان جیاوازیی نیە.

**تەیمور: کەسێک دەنگی لێوە نەدەهات، کەسێک نە خۆی ڕاپسکان نە قیژەیەکی کرد. ئەو دەنگەی کە هات دەنگی ئەفسەرەکە بوو، دوا بەدوایدا دەنگی گوللە.**



وێنەی ژنێکی بۆسنی دوای وەستانی جەنگ بە ڕەسمی. لە "ئەسۆشیەیتد پرێس"ەوە

**سەدان دایک لە کوردستان کاسەسەرێکیشی لە منالەکەی بۆ نامێنێتەوە بەسەریا بگری. کێ بەرپرسیارە؟ چارەسەر چیە؟ بۆ خەڵک لە ڕاستیدا ئەیەوێت ئەم بارە بگۆڕێت؟**

***وەڵام: ژمارەکانی داهاتوو***

پرۆسەکە ٣ هەنگاوە: دیاریکردن، کۆکردنەوە، لەناوبردن. واتە قۆرتی یەکەمی پرۆسێسی ئەنفال دیاریکردنی کەسەکانە کە دەبێت کورد بن و لە یەکێک لەو ناوچانەدا بن کە لەسەرەوە ناومان بردن (ناوچەکانی ئەنفالی ١-٨). دووەم کۆکردنەوەیانە، دوای کۆکردنەوەیان لە چەند مەرکەزێکی ناوچەکەدا، ڕەوانەی تۆپزاوە، توسخورماتوو، قۆرەتوو، تکریت،.. ئەکرێن. کۆکراوەکان کە ژمارەیان زیاد دەبێت ئیتر لەوشوێنانەوە ئامدەیان ئەکەن بۆ دوا قۆرتی پرۆسێسەکە: کوشتن. لە بیابانەکانی سنوری سعودییەو سەماوەو ڕومادی دەست بە کوشتنیان دەکرێ و بە بیلدۆزەر ئەخرێنە ژێر چاڵەوە.

## ڕۆژی حەشر

ئەوانەی بەر ئەم هێرشە کەوتن دەڵێن؛ ڕۆژی حەشر. حکومەتی عێراقیی جگە لە هەموو جۆرە چەکی قورس و هێزیی هەوایی چەکی کیمیاویشی لە هەر هەشت ناوچەکانی ئەنفالدا بەکارهێناوە.
سروشتی هێرشەکان بە شێوەیەکی زۆر ترسناک و دڕندانە بوون. لە هەواو زەویەوە ناوچەکان بە تۆپ و ڕاجیمەو چەکی کیمیاویی ئەکوتن. بە سەدهەزارەها هێزی سەربازیی و جاش تەوقی ناوچەکان ئەدەن. گوند بە گوند ئەوەی نەکوژراوە لە ژن و منال و پیاو کۆی دەکەنەوە. پارە، ئالتون، ئاژەڵ، کەلوپەلی ناوماڵ و تراکتۆرەکانیان بە تالانی کۆدەکەنەوە. زیلەکان لە کەنار گوندەکاندا ئامادەن بۆ ئەوەی سەربازەکان بە شەق و زللە گوندییەکان فڕێ بدەنە ناویانەوە. لە بەرچاویاندا ئاگر ئەنێن بە خانوەکانیانەوەو لەو لاشەوە بیلدۆزەرەکان خۆیان ئامادە کردووە بۆ تەخت کردنی پاشماوەکان. بە سەدەها و هەزارەها، لە گەرمای هاویندا، بێ خۆراک و ئاو ئەخرێنە هۆڵەکانەوە. ژن و منال لە پیاوان جیا دەکەنەوەو پەیتا پەیتا کاروانی ١٠٠٠-٢٠٠٠ نەفەریی بۆ بیابانەکانی خوارووی عێراق بەڕێ دەکەن بۆ کوشتن. چەندەها شوێنەوارو کەنیسەی هەزار ساڵە لەگەڵ ئەرزدا تەخت ئەکەن.
ئەو کەسانەی توانیان لە ناوچەی ئەنفالی یەکدا خۆیان ڕزگار کەن هەڵ ئەهاتن بۆ ناوچەی ئەنفالی دوو. ئەگەر لەوێش بەرنەکەوتنایە، ئەوا ئیتر لە ئەنفالی ٣دا هەموو ڕێگاکان داخرابوو. تەنها ئاسمان کراوە بوو ئەویش فڕۆکەکان و هەلی کۆپتەرەکان تەنیبوویان. کون و ئەشکەوتەکانیش کیمیاوی پڕی کردبونەوە. دەرکردنی ڕۆح کارێکی ئاسان نەبوو.
بەڵگە نامەکان دەگێڕنەوە ئەوانەی دەرفەتێکیان دۆزیەوە بۆ هەڵهاتن، چەندەها ڕۆژ لە کێوەکان گیایان دەخوارد. هەر لە ڕێگای ئەو دەرفەتەدا بوو لەم دۆڵەدا ٦٠کەس لە سەرمادا ڕەق بوونەوە، لەولاتر شەش،..هتد

**زوبەیدە**(ئەنفالی یەک) دەگێڕتەوە:
"ڕەحمانی برام پێشمەرگەی یەکێتی بوو، لە ئاوەکە من و دایکم و باوکمی پەڕانەوەو لەوبەرەوە هەر هاواری دەکرد: بڕۆن بڕۆن! خۆتان دەرکەن!، بڕۆن! ئەوە دوا جار بوو گوێمان لە دەنگی بوو. ڕەحمان خۆی گەڕایەوە بۆ یارمەتی دانی خەڵکەکە" دوای دوو حەفتە عومەری براشی لە سنورەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەکە. پێشمەرگەیەکی تر خەبەر ئەهێنێتەوە بۆ دایکوباوکی ڕەحمان: "عومەرو ڕەحمان یەکتریان دۆزییەوە، لە شوێنێکدا تا دوا فیشەک دژی هێزەکانی حکومەت بەرگرییان کرد. من بە دووربین تەماشام ئەکرد، بینیم کەوتنە دەست هێزی دوژمنەوە، ئیتر نەبینرانەوە".
چەندەها پێشمەرگەی ی.ن.ک لەسەر ئاوی دوکان و لە دەشتەکانی گەرمیاندا تا دوا فیشەک بەرگرییان کرت.

**تەیمور** (ئەو کاتە ١٢ساڵ)

پێشمەرگەیەک هەواڵ ئەهێنێتەوە بۆ دایکوباوکێک ◁

## عومەر و ڕەحمان یەکترییان دۆزییەوە، لە شوێنێکدا هەتا دوا فیشەک دژی هێزەکانی حکومەت بەرگرییان کرد.

شەش کەس شایەتی هەر ٣ قۆرتەکەی پرۆسێسی ئەنفالن لە گرتنەوە بۆ کۆکردنەوە تا کوشتن. تەیمور یەکێکە لەوان. ناوبراو خەڵکی گوندی کوڵەجۆی گەرمیانە. لە سەربازگای قۆرەتو لە هۆڵێکدا لەگەڵ دایکی و ٣ خوشکەکەی و سەدەها ژن و منالی تردا لە پیاوان جیاکراونەتەوە. بۆ دواجار لە کونێکی هۆڵەکەوە باوکی لە دەرەوە لەناو ئەم دیمەنەدا دەبینێت:

"چەندەها زیل ئامادەکرا بوون، جلیان لەبەری پیاوەکان دادەکەند، تەنانەت پێڵاوەکانیشیان. دوو کەس دوو کەس دەستیان دەبەستن و فرێیان ئەدانە زیلەکانەوەو ئەیان بردن. ژنەکان لە ژورەوە دەگریان، لە خۆیان ئەداو دەیان لاوانەوە. دەمان زانی بۆ کوشتنیان دەبن".

تەیمور خۆشی، دە ڕۆژ دوای باوکی، بەیانیەکی زووی مانگی ٨ یەکێک دەبێت لەوانەی کۆیان دەکەنەوەو بە سەیارەیەکی سەر گیراو بەرەو خوارووی عێراق، سنوری سعودیە ئەبرێن. تەیمور پێشتر توانیبووی چاوی خۆی بکاتەوە.

تەیمور ئەڵێت: کە دایان بەزانین هەموو لە تینوێتی و برسێتیدا شەکەت بوبوین. کات ئێوارەیەکی درەنگ بوو. بۆ هەر سەیارەیەک چاڵێک ئامادە کرابوو، خراینە ناو چاڵەکانەوە، دنیا بێ دەنگ بوو، کەسێک دەنگی لێوە نەدەهات، کەسێک نە خۆی ڕاپسکان نە قیژەیەکی کرد. ئەو دەنگەی کە هات دەنگی ئەفسەرەکە بوو، دوا بەدوایدا دەنگی گوللە. لە دوولای چاڵەکەوە بۆمان دانیشتبوون گوللەیەکم بەرکەوت و هەڵسامەوە، بە لێژایی چاڵەکەدا هەڵ گەڕام، سەربازەکە پاڵێکی پێوە نامەوە بۆ ناو چاڵەکەو گوللەیەکی تریشم بەرکەوت. سەربازەکان بڵاوبونەوەو بیلدۆزەرەکان کەوتنە ئیش. بە چاڵەکەدا هەڵ کشام، کە ئاوەڕووم دایەوە لاشەی هەموایانم بینی؛ سارای دایکم، گیلاس و لەیلاو سروەی خوشکم، ٣ پورم، مەعسومە کە ٨ منالی پێ بوو. کچێکی بچکۆلەم دی جلی کوردی لەبەردابوو دەجولایەوە، گوللەیەک بەر دەستی کەوتبوو، ئەو نەهات لەگەڵم وتی؛ دەترسم، لە سەربازەکان دەترسم، ناتوانم بێم."

تەیمور خۆی قوتار دەکات، خوێنێکی زۆری لێ دەڕوات، لە دوایشدا لە بیاباندا دەکەوێتە دەستێکی بە سۆزی خێڵێکی عەرەبەوە. تەیمور لە مانگی دەی ١٩٩٠دا بە ڕێگایەکی نهێنی و سەختدا دەگاتەوە دەستی مامی و کوردستانە وێرانەکەی.

**کەنعان مەکیە** بەهاری ١٩٩٢، لە قۆرەتو ئەنوسێت:

"پادگانێکی گەورەی سۆڤیەت-دروستکراوی ڕوخاو، چەند شەروالێکی کاڵبوەوە دڕاو، تێکەڵاوی قوڕو پیسیی بوبون، بەعەرەبانەی تراکتۆرەکاندا هەڵ واسرابوون. تاکە پاتەو نەعلی پلاستیک لێرەو لەوێ کەوتبوون، چەند قوتویەکی بەتاڵ، ئەمە تەنها پاشماوەیەک بوو لە دەهەزارەها کورد کە لەم شوێنەوە لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە بەرێ کران بۆ بیابانەکان*

سەرچاوەکان:

١ـ Genocide In Iraq
The Anfal Campaign Against The Kurds
Middle East Watch

٢-کەنعان مەکیە، القسوە والصمت



**کێ ئازاری ڕۆژی حەشر بەرز ئەکاتەوە!
ئەوانەی دەستیان ئەڕوات خۆیان لایەنن لە تاوانەکاندا،
ئەوانەی دەرچوون ئەو ڕەشوڕوتە بێ دەسەڵاتانەن کە دەنگیان ناگات بە کەس،
ئێمەی زیندوو نەمان توانی دەستێکی خۆشەویستی بگەیەنینە سەرەمەرگی قوربانیەکان،
بەڵام ئەتوانین لەم مەرگانە دەستێک دروست کەین،
لەگەڵ بەم
ئەوانەی کوژران لەجیاتی هەمووومان تیا چوون.**

*کوردستان سۆلیداریتی ئەنوسێت:* **"شەرمەزارییە بۆ من و تۆ ڕازی بین منالانی کوردستان لە جیاتی خوێندن و یاریکردنی ناو باخچەکان، لە کەلاوە دەسکردەکانی بەعسییە فاشیەکاندا بەبێ هیوا گەورە ببن. ئەگەرچی ئاسۆی کوردستان لێڵ و تاریک بێت بەڵام مرۆڤی کارامە لە کاتی تەنگانەدا پشت ناکاتە گەلەکەی خۆی".**

*ئەمانە چییان کردووە؟ وەڵام: ژمارەی داهاتوو*

# شەهیدەکان

**ئەو جانتا پارانەی ئەخرێنە بانقەکانی ئەورووپاوە وەڵامی ئەم نامانە نین. ئەو**

## سەرکردەی حیزبەکان

**ناوی شەهید: جەمالە ڕەش** (جەمال شێخ عەلی مارف)
**ڕۆژی لە سێدارەدان: ١٩٧٨/١/٢٨**
**بەندیخانە: موسڵ**

**•جلی ڕەشم بۆ نەکەن و سەربەرزو ڕووسوور لەناو خەڵکیدا خۆتان دەرخەن!**
**•هەموو ساڵێک یادم بکەنەوە!**
**•تا پەتەکە ئەکەن بە ملماندا لە سرودو هوتاف کێشان ناکەوین.**

جەمالە ڕەش لە نامەکانیدا کە لە ژووری ئیعدامەوە نوسیونی ئەڵێت:
*هیوادارم کە ئاگاتان لە گوڵزارو شانازو قالە بێت. چونکە زۆر حەزم ئەکرد نازی ئەو سێیانە هەڵ گرم و خزمەتیان بکەم.
*بە نیسبەت ئەو هاوڕێیانەی کە بە نەشیدو هوتاف کێشانەوە ئەچنە بەر پەتی سێدارە، دوژمنەکانمان دێن و لێمان ئەپاڕێنەوە کە بێ دەنگ بین. بەڵام هیچ شتێک نیە کە کاریگەریی بکاتە سەر ئێمە. تاکو پەتەکە ئەکەن بە ملماندا هەر لە سرودو هوتافکێشان ناکەوین. جەلادەکان دەڵێن؛ لەوەتی ئێمە لێرەین شتی وەکو ئێوەمان نەدیووە.
· هاوڕێ گیان! ئەوا ناوی ئەو شەهیدانەم بۆ ناردن کە لە (٨/٨/-١/١١/١٩٧٧)دا لە سێدارەدراوون. هەروەها چەند کەسێکی تر کە لەسەر دیوارەکە ناویان نوسرابوو. ئێستا ئێمە (٣٥) کەسین کە لە ژووری ئیعدامدا ماوین. هەر ڕۆژە بەرە بەرە لێمان ئەڕوات. وەکو گورگ چۆن لە ڕانە مەڕ ئەدات، جاری یەکێک یان دووان ئەبەن. شەوی وا





وێنەی لاوێک لەو شەشەی لە شوباتی ١٩٨٦دا لە نزیک سجنی سلێمانیدا لەبەرچاوی خەڵک گوللەباران کران.

# ئەگەڕێنەوە

## پێشمەرگەکانەی لە دژوارترین ڕۆژدا دەسیان دایە چەک، بۆ مەسەلەی نیشتیمان بوو

## چییان لەمانە دروست کرد؟

هەبووە (٧) کەسیان بە یەکجار ئیعدام کردووە. لەم شەوانەدا (٩٣) کەسیان لە ئەبوغرێب ئیعدام کردووە.
.منیش و ئەو هاوڕێیانە خۆمان ئەکەینە سووتەمەنی بۆ شۆڕشە پیرۆزەکەمان. ئەو کەسانەی کە ئیعدام ئەکرێن هەموو بە دەستی کوردە خائینەکان تووش بوون و هیچ کەسێک دوژمن نەی گرتووە.

### .بابە گیان! دایە گیان!

وەک دایک و باوکی کوڕێکی شۆڕشگێڕ گوێ ڕاگرن لە قسەکانم! زۆر جێی شانازییە بۆ من کە گەلەکەم وەک شەهیدێکی خۆی وەرم بگرێت. داوای لێبوردنیش لە گەلەکەم ئەکەم کە نەمتوانی لەوە زیاتر خزمەتی بکەم. ڕاستە ئەڵێن ژیان خۆشە، بەڵام ئایا ئەزانن لەوە خۆشتر خۆبەختکردنە لە پێناوی میللەتدا؟ مردنێک ژیان لە دوای خۆی دروست بکات مردن نیە، ژیانە. ژیان، لەمردنی ئەمڕۆی ئێمەدا بۆ نەوەی داهاتوو دروست ئەبێت*

ناوی شەهید: **ئاشتی** (ئەبو بەکر نوری قادر)



**ڕۆژی لەسێدارەدان: ؟**
بەندیخانە: موسڵ

**•هیوام وایە ئەو ڕێگەیەی کە ئێمە گرتوومانە ئێوە تەواوکەری بن.**
**•دەستی یارمەتی بۆ کەسوکاریی شەهیدان درێژ بکەن!**
**•بە شانازییەوە ئەو پەتە ئەکەمە ملم.**

.هاوڕێیان، گەرمترین سڵاوی شۆڕشگێڕیتان پێشکەش بێت! هیواو ئاواتم سەرکەوتنتان و بەدی هێنانی ئامانج و ئاواتی میللەتە ڕەشوڕوتەکەمانە. لەم کاتەدا کە ئەم نوسراوە بۆ ئێوەی بەڕێز ئەنوسم، بڕیاری خنکاندنم لەگەڵ (١٥) کەسی تردا دەرچووە. سەعات (١٢)ەی شەو هەڵدەواسرێین و تەنها نزیکەی (١٠) سەعاتمان ماوە.
.هیوام وایە کە ڕۆژێک سەرکەوتنمان بەدی هێنا، بێن و لاشەکانمان بەرنەوە بۆ سلێمانی، لە گردێک لای شەهید ئارام بمنێژن. هیوام وایە کە لە گۆڤارەکاندا یادمان بکرێتەوەو لە بیر نەچین. هەمیشە دەستی یارمەتی بۆ کەسوکاری شەهیدان درێژ بکەن و لە بیرتان نەچن. چونکە پرسینەوەتان مانای وایە کە ئێوەی دڵسۆز کوڕی ڕاستەقینەی میللەتن. هەروەها هیوادارم کە ئەم نوسراوەی دەینووسم بۆتان هەڵی بگرن و پاشەڕۆژ لە گۆڤارێکی شۆڕشدا بڵاو بکرێتەوە.
.بە شانازییەوە ئەو پەتە ئەکەمە ملم کە کراوەتە ملی شەهیدان؛ جەعفەر، ئەنوەر، شەهاب و ئێمە نیشانی میریی دڕندەمان داوە کە ئێوەو ئێمە هیچ باکمان نیە لەمردن*

**سەرچاوەی نامەکان:**
چاپی یەکەم، ١٩٨٢/١، ی.ن.ک، چەند نامەیەک لە زیندانی فاشستەکانەوە.



## سەددام حوسەین: ئەوانە خیانەتیان لە نیشتیمان و هەموو دابی کۆمەڵایەتی کرد، ئێمەش ناردمانن بۆ جەهەننەم.

سەعات ٢ی شەوی ١٩٨٣/٩/٣٠ لە کۆمەڵگا زۆرەملیەکەی" قوشتەپە". سەربازی عیراقی ٨٠٠٠ پیاو لە بارزانیەکان لە سەرو ١٢ ساڵانەوە کۆدەکەنەوەو لە تۆڵەی گرتنی حاجی هۆمەران دا دەیانبەن. ئەمە جگە لە کۆکردنەوەی عوبێدوڵای کوڕی مەلا مستەفاو ژمارەیەکی تر کە لە شوێنانی تر بوون. هەندێک سەرچاوە لەوانە نەوشیروان مستەفا، دەست بۆ ئەوە ڕانەکێشن کە پێشتر سەرانی پارتی قسەیان لەگەڵ سەددام هەبوەو پەیمان شکێنیان لەگەڵدا کردووە. سەددام تۆڵەی خۆی لە هەزارەها بەرزانی بێ ئاگاو بێ خەتا ئەکاتەوە. بەڵام سەددام هەرچەندێک بکوژێت ناتوانێت ئەو ڕاستییە بگۆڕێت کە ئەگەر مەنجەڵ هەڵ بدمیت سەرقاپی خۆی ئەدۆزێتەوە.

سەدام حسێن لە تەلەفیزۆنی عێراقیدا دەربارەی بارزانیەکان دەڵێت" ئەوانە خیانەتیان لە نیشتیمان و هەموو دابی کۆمەڵایەتی کرد، ئێمەش ناردمانن بۆ جەهەننەم".


مسعود بارزاني

## مەسعود بەرزانی: وتارەکەی سەرۆکی فەرماندە بەڕێز سەددام حوسەین ئاواتی هەموو عێراقییەکی شەریف دێنێتە دی.

مەسعود بەرزانی ساڵی ١٩٩١ ئەڵێت: "وتارەکەی سەرۆکی فەرماندە بەڕێز سەددام حوسەین لە بیرەوەریی ٢٢ ساڵەی مەزنی ١٧-٣٠ی تەموزدا، وتارێکی مێژوویی‌و ئاواتی هەموو عێراقییەک و نیشتیمان پەروەرێکی شەریف دێنێتە دی(١)". ناوبراو دیارە ئاواتەکەی هاتۆتە دی و بەڵام ئەوانەی ئەنفال کران، لەدار دران، لە شەڕدا شەهید بوون نە شۆڤڵ نە پارەی برایم خەلیل هیچیان بەرنەکەوت، تەنها شەرەفیان برد لەگەڵ خۆیان. تۆ بڵێی ئەوەی مەسعود بەرزانی یش ئەیبەخشێتەوە هەر شەرەف بێت؟

*ڕۆژی ١٩٩٦/٨/٣١ "پارتی"، دوای ئەوەی "یەکێتی" و ئێران ئەبن بە مەترسیی بۆ خەتی نەوتفرۆشتنی سەرانی پارتی و سەرانی حکومەتی عێراق، پێش سوپای عێراق ئەکەوێت بۆ گرتنەوەی هەولێر.

(١)خەرمانە:ژ.٣، ١٩٩١


□□ علي حسن الجيد.

## عەلی حەسەن مەجید: ئەم سەگانە ئەبێت سەریان پان کەمەوە. بە بیلدۆزەر بیان نێژم

ڕۆژی ١٩٨٧/٣/١٨ بۆ لەناوبردنی مەسەلەی کورد لە عێراقدا بە یەکجاریی، عەلی حەسەن مەجید دەکەن بە سکرتێری کشتی حیزبی بەعس لە باکور. هەموو دەسەڵاتی سەربازی و مەدەنی ڕاستەوخۆ دەخرێتە ژێر دەستیەوە. ناوبراو نزیکەی ساڵێک دائەنێت بۆ خۆئامادەکردن. هەموو هێزەکانی چەکداری ئەمن، جاش و مەدەنی بۆ "هێرشەکانی ئەنفال" بەکار دەهێنێت. کوردوستان وەک ناوچەیەکی جەنگی و قەدەغەکراو تەماشا دەکرێت. عەلی حسەن لە یەکێ لە کۆبونەوەکانیدا لە کەرکوک دەڵێت:"وتم لەوانەیە چەند پیاوێکی باشیان تیا بدۆزینەوە، بەڵام هەرگیز. ئەم سەگانە ئەبێ سەریان پان کەممەوە. ئەبێ بە بیلدۆزەر بیان نێژم". ئەم پیاوە ترسنۆکە کە لە هێرشی ئەنفال ئەبێتەوە، پاش کوشتنی هەزارەها ژن و منال، ئەڵێت؛ "من بۆ شوێنێک نەکراوم شەڕو هەرای تیا نەبێت". کوردستان بەجێ دەهێڵێ بەڵام کەس نەی بیست لە شەڕی کەنداودا لە یەکێ لە کونەکانی ژێر زەویدا نەبوو بێت. زاڵم هەمیشە تاوانبارێکی ترسنۆکە.


حسين كامل

## حسەین کامیل سەگی بەوەفای سەددام حوسەین

حسەین کامیل، حەرەسێکی ئاسایی، ئەبێت بە شۆفێری ئەحمەد حەسەن بەکر (سەرکۆماری پێشوو). سەددام ئەبێ بە سەرکۆمار. دەنگی دەرمانخواردکردنی "بەکر" بڵاو ئەبێتەوە. حسەین ئەبێ بە حەرەسی یەکەمی سەددام. بێ دەورە ئەبێ بە ملازم ئەووەل. سەددام سێ کچی خۆی ئەدا بە حسەین و دوو برای. حسەین ئەبێ بە وەزیری پیشەسازیی و دروستکردنی کەرەسەی سەربازیی. دوای لەناوبردنی وەزیری نەوت و وەزیری دیفاع ٣ وەزارەت ئەگرێتە دەست خۆی. تیپی تایبەتی حسەین لە گرتنی کوێت دا دەکەوێتە تالانیی، بەمە تێر ناخوات پارەیەکی زۆر چاپ ئەکات. سەددام ئەچێتە سەری، پاش کوشتنی چەند حەرەسێکی، حسەین زەلیل ئەکات، لە وەزارەتەکان لای ئەبات. دواتر سەددام لەسەر تەلەفیزۆن ئەڵێت: حسەین بێ خەتایەو دەیخاتەوە جێی خۆی.
لە ڕاپەڕینەکەدا سەددام ٦کەس بۆ کوشتاری خەڵک کۆ ئەکاتەوە: حسەین و سەددامی برای، دوو کوڕەکەی سەددام حسەین خۆی، عەلی حەسەن مەجیدو مودیری ئەمنی تایبەتی. خەڵکی بەغداد ئەم تاوانبارە ناو ئەنێن: سەگی بەوەفای سەددام. ناوبراو لەگەڵ سەددامی برایدا بە کچەکانی سەددامەوە ڕایان کرد بۆ ئەردەن، دوای ماوەیەک گەڕانەوە بۆ عێراق و سەددام کوشتنی.


جلال طالباني

## جەلال تالەبانی بارەگا بۆ خوالێخۆشبوو حسەین کامیل ئەکاتەوە

جەلال تاڵەبانی ئەڵێت: "خوالێخۆشبوو حسەین کامیل چەند جارێک بە تەلەفون پەیوەندی لەگەڵدا کردم، چ لە لەندەن و چ لە دیمەشق. من ڕام وابوو کە موعارەزە ئەبێ ئەم پیاوە بگرێتە خۆی. لەگەڵ برایان لە سوریاو ئێران چەند هەوڵێکم دا بۆ پێشوازیلێکردن و گوێگرتن لێی، لەبەرئەوەی لە بڕوای ئەوەدام کە پێویستە هانی هەموو ئەو ئەفسەرانە بدرێت کە ڕۆژێ لە ڕۆژان کەوتونەتە هەندێک تاوانەوە، بۆ جیابونەوە. لەبەرئەوەی ئەگەر هانیان نەدەین بۆ جیابونەوە، ئەوا دیکتاتۆر چەند ئەفسەرێکی لە دەور ئەمێنێتەوە کە لە بڕواهەبوون بە عەدالەت و تەبیعەتی ڕژێمەوە نا، بەڵکو بۆ پارێزگاریی ژیانی خۆیان، بەرگریی لە ڕژێمی دیکتاتۆر بکەن". لە وەڵامی ئەوەدا بۆ بەیەک شاد نەبوون، تاڵەبانی ئەڵێت: "چاوپێکەوتن دروست نەبوو چونکە من نەمتوانی بچم بۆ ئوردن و ئەویش نەی توانی بێت بۆ سوریا. بانگم کرد بۆ میوانیی کوردستان و بۆ کردنەوەی بارگا بۆی لە ناوچەکەماندا، وە هەوڵم دا بۆی بسەلمێنم لەگەڵ ئەوشدا کە حسەین کامیل و تاقمەکەی تاوانیان دەرهەق میللەتی کورد کردووە، بەڵام کورد میللەتێکی لێبوردەیەو دەڕوانێتە داهاتوویەک کە عێراق تیایدا مووەحەدو موتەجانیس و لێبوردەو دیموکراتی و فیدراڵی و تەعەدود بێت. لەبەرئەوە ئەڵێم مەجال کراوەیە بۆ هەر یەکێک بیەوێت لە سەددام حسەین ببێتەوەو بگەڕێتەوە ڕیزی گەلی عێراقی". (المشاهید السیاسی، ژ: ٤٨، ٦٩٩٧).


The Guardian, 25/4/91


Reuters, May 1991

**کەم ماڵی کورد هەیە لە باشوری کوردستاندا جولانەوەی چەکداریی کورد لەسەری نەکەوتبێت. بەڵام ئایا هەتا ئێستا جولانەوەکە چی بەدەست هێناوە بۆ ئەو خەڵکە؟ کەم ماڵی کورد هەیە بە بەردەوامیی باسی مەسەلەی کوردو دەنگوباسەکانی تیا نەکرێت، بەڵام ئایا ئەم هەموو باسانە گەشتوون بە کام چارەسەر؟ ئەوانەی دەنگیان ئەبیسترێت دەسەڵاتدارو نوسەرەکانن، ئەی ئەو کەسانەی لە دەرەوەی ئەمانەن ئەڵێن چی؟**

## پەری خان:
## تا ئێستا شتێکیان نەکردووە من تێی نەگەم.
## ژنیان هەر بۆ پارەکۆکردنەوەو چەک شاردنەوە ویستووە.

## ڕەفعەتی مەلا: هیچیان نوێنەری میللەت نین.
## نارەزایی توانی بەعس دەرکات، ئەتوانێ حیزبەکانیش دەربەرێنێت.

کە ئەچیتە ماڵی کاک **ڕەفعەتی مەلا**، ٢١ وێنە بە دیوارەکەوە لە بەردەمتا ڕائەوەستن. **شوان** لە قازانقایە بەدەستی جاشەکانی تەحسین شاوەیس شەهید کراوە. **کامەران** ساڵی ١٩٨٥ لە سەرچنار ئەگیرێ و پاش سێ ساڵ بەعس پێیان ڕائەگەیەنێت کە ئیتر بە دوایدا نەگەڕێن. نۆزدە کەس ڕۆژی ١٩٩١/٤/٢ لە چیمەن ئەکوژرێن. دوای ئەم هەموو شەهیدە ئەم خێزانە نە هاتونەتە سەر کوردستانێکی ڕزگار کراو، بە پێچەوانەوە پەریونەتە ئەمبەری دنیا؛ سوید.
کاک ڕەفعەت لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە ئایا ئەمەی ئێستا ئەوەیە کە ئەو هەوڵی بۆ دا، ئەڵێت: نەخێر! دەربارەی ئەوەی کێ بەرپرسیارە لەم ڕۆژە، ئەڵێت: "ئەوەی ناوی خۆی ناوە سەرکردەی جولانەوەی کورد، دەوری خراپی وڵاتەکانی دەوروبەریش هەر ئەکەوێتەوە سەر شانی کوردەکە خۆی".
دەربارەی شەڕی یەکێتی و پارتی وەکو شەڕی بەرەی گەل و بەرەی دوژمن، کاک ڕەفعەت ڕای وایە کە بوونی پارتی بە جاشێکی نێو دەوڵەتی، وای کرد کە جیاوازییەک لە نێوانی ئەو دوو هێزەدا هەبێت. ناوبراو ئەڵێت: "هەرچەندە لام وایە کە سەرکردایەتی ی.ن.ک لەو ئاستەدا نیە بتوانێت سەرکردایەتی مەسەلەی کورد بکات، ئەوانیش هیچ بەرنامەیەکی ڕونیان نیە، چ لە ڕوی سیاسی و چ لە ڕوی ئابوری و کۆمەڵایەتیەوە، هەر ڕۆژەی دروشمێک هەڵ ئەکەن و ئەگەر "یەکێتی"ش لای وابێ ئەوەی پارتی ئەیکات خیانەتە چۆن هەوڵی ڕێکەوتنیان لەگەڵ ئەدات". ناوبراو لای وایە کە هیچ کام لەو حیزبانە نوێنەری میللەتی کورد نین و ئەبێت ئەو خەڵکە شتێکی تر دروست بکات. دەست بۆ ئەو کوردستان جێهێشتن و برسێتی و خراپەکاریی و زوڵمە ڕائەکێشێت کە لە ژێر دەسەڵاتی حیزبەکاندا بەردەوامە، لای وایە کە ئەو نارەزایییەی بەرامبەر ئەو بارە ناهەموارە هەیە پێویستە ڕێک بخرێت بۆ دروستکردنی هێزێکی سیاسی. کاک ڕەفعەت ئەڵێت: "هێزی نارەزایی خەڵک توانی بەعس لە کوردستاندا دەرکات. من بڕوام بەوە هەیە کە ئەم هێزە ئەگەر نەشتوانی سەد دەر سەد ئەم حیزبانە دەربەرێنێت، ئەتوانێت تێیان بگەیەنێت کە هیچ پایەگایەکیان لە ناو خەڵکیدا نەماوە".
بە لای ناوبراوەوە ئەمە تاکە چارەسەرە بۆ کێشەی ئێستا. کاک ڕەفعەت ئەڵێت: "لە ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥دا خەڵک نەی ئەویست کوردستان بەجێ بێڵێت، ئێستا لەژێر سایەی حکومەتی بەناو کوردیدا خەڵکی سەری کردۆتە سەر وڵات چۆڵکردن، ئەمە کارێکی خەتەرە".
دەربارەی ژنبەسەراهێنانی سەرانی یەکێتی ئەڵێت: "شتی شەخسی ئەوەیە کە دور بێت لە سیاسەتەوە. جگە لەوە ئەوانە لافی مافی ئافرەتانیان لێ ئەداو ئەوەی ئێستاش ئەیکەن پێچەوانەی بەرنامەی خۆیانە، بەتایبەتی کە زۆربەیان خۆیان بە مارکسی لە قەڵەم ئەدا. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە ئەو ئافرەتانەی ئەوان ژنیان بەسەردا هێنان لە خەباتدا لەگەڵیان بوون و ژنی ڕۆژی تەنگانە بوون".
ژن و مناڵ کارەساتەکان زیاتریش بکەوێت لەسەریان، هەر دەوری پاشکۆیەتییان هەیە. با بزانین ئەوان کێن؟ ئەڵێن چی؟
**پەری خان** ی هاوسەری کاک ڕەفعەت ئەگێڕێتەوە: لە بەرگەڵو، **کاژان و ڕۆژان** یاریان ئەکرد. لەو کاتەدا حەمە تۆفیق بەوێدا ڕەت بوو. بانگمان کرد بێت چایەک بخواتەوە. مناڵەکانمان هێنایە ژورەوەو تۆپێک لەو شوێنەی دا کە مناڵەکان یاریان تیا ئەکرد.
پەری خان ئەڵێت: "بە درێژایی هەشت ساڵی دەرەوەم هیچ کەسێک نەهات قسەیەک لەگەڵ من بکات، لە هیچ بارەیەکەوە، نە سیاسەت نە ژیانمان".
تۆ بڵێی هی ئەوە نەبێت کە ئەوەی ئەو پیاوانە کردویانە عیلموعیرفانێکی بەرز بوو بێ و ژنان سەریان لێی دەرنەچوبێت؟ با بزانین پەری ئەڵێت چی:
-هەتا ئێستا شتێکیان نەکردووە من تێی نەگەم. پیاوی کوردیش سەربەستی نەداوە بە ژن تا بتوانێت بەشداریی بکات لە سیاسەتدا، ڕێکخستنی ناوشاری ژنانیش هەر بۆ بەتانی و پارەکۆکردنەوەو چەک گواستنەوە بووە، ڕایان قەد وەرنەگیراوە، ئەمە شتێک بووەو سیاسەتیش شتێکی تر.
پەری ئەڵێت: "کوردستانیان دایە دەم کورگ. من کە بزانم "میکرۆب"م بۆ میللەتەکەم دائەنیشم". بەڵام ئایا میکرۆب دائەنیشێت؟ پەری خان ڕای وایە لە جیاتی ئەوەی باسیان ئەکەن، بیربکەنەوە شتێک بکەن. زۆربەی ئەوەی لە دەرەوەیە پێشتر دژی بەعس کاری کردووە، کەچی ئێستا هەر کەس لە ماڵی خۆی لێی دانیشتووە، لە ژورەوە باسی حیزبەکان ئەکەن کە ئەشچنە دەرەوە ناوێرن هیچ بکەن. ئەمە خۆی مردنە*

١٩٩٧/١١/١

# بۆ کورد ئەبێ لە پاشاگەردانیدا بژی؟

*بۆ کورد ژێردەستەیەو ئەبێت لە پاشاگەردانیدا بژی، پرسیارێکە سەعید سەقزیی مناڵ بووە لە بەردەمیدا وەستاوە. بەڵام ئایا سەعید چی کرد بۆ ئەم پرسیارە؟ با بزانین خۆی ئەڵێت چی:*

-کۆمەڵە بیروباوەڕێکی تازە بوو لە کوردستاندا سەری هەڵدا. کاتێک هێزەکانی ئێران ئەیانویست بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، کۆمەڵە هانی خەڵکی ناوچەکەی دا کە بە ژن و منداڵەوە لە پێش تانک و تۆپەکانی ئێراندا ڕابوەستن و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک نەیان هێشت پێشڕەوی بکەن. کۆمەڵە لە مانگرتنە مێژوویەکەی خەڵکی شاری سنەدا کە سەرکەوتووانە کۆتایی پێ هات و پاسدارانی لە سنە وەدەرنا، دەورێکی باشی گێڕا. لە لای ئێمە کە پێی ئەڵێن کوردستانی ئێران خوێندن و نوسین بە کوردی قەدەغەیە. قوتابخانەو دانیشگا بە فارسییە، ڕۆژنامەو کاروباری ئیدارەکان بە فارسیە. منداڵ لە حەوت ساڵییەوە کە ئەچێتە قوتابخانە تا دانیشگاش تەواو ئەکات بە سرودی "ئەی ئێران"، بە شیعری فارسی و فەرهەنگ و کولتوری فارس مێشکی ئەخنرێ و وای پەروەردە ئەکەن کە زبان و ئەدەب و کولتوری کورد بە کەڵکی هیچ نایە و ئابووری و ئیمکانیەتی ژیانی کوردستان زۆر بێ ناوەڕۆکەو ئەوەی کە پەیوەندی بە کوردستانەوە هەبێت لێی ئەکەن بە شتێکی سووک و بێ بایەخ و وای لێ ئەکەن کە پێی شورەیی بێت باسی کوردستان بکات، ئەیگەیەننە ئەو قۆناغە کە نەتوانێ بڕوای بە خۆی بێت. ئەم سیستێمی داگیرکردنە زۆر لە کۆنەوە لە کوردستاندا پەیڕەو ئەکرێ، بە تایبەتی ئێران لەم سیاسەتەدا زۆر سەرکەوتنی بەدەس هێناوە. ئەم سیاسەتە لەسەردەمی ئیسلامەوە لەسەر کورد پیادە دەکرێ. عەرەبەکان ئەیان وت عەرەبی فێربن چونکە پاش مردن بە عەرەبی لێتان ئەپرسنەوە. عەرەبەکان مەبەستیان لەم سیاسەتە تەنها خاڵیکردنی مێشکی ئەو میللەتیە لە کولتورو ئەدەب و زمانی میللیان، دەنا ئەگەر خوا زمانی کوردیشی خەڵق کردبێ بۆ نابێ لە زمانی کوردیی تێ بگات! دینی هاوبەش و هەندێک شتی نزیک لەیەک، کاری داگیرکەرەکانی کوردستانی تا ڕادەیەک ئاسان کردووە، کاری کەردۆتە سەر مێشکی ڕابەرەکانیش کە نەتوانن بڕوایان بە خۆیان ببێت. ئەو کوردەی کە خۆی بە ڕوناکبیرو ئازادیخواز بزانێت چاوەڕوانە کە لە لایەن ڕووناکبیری گەلی سەردەستەوە کارەکانی پەسەند بکرێت. ئەو کوردەی کە خۆی بە چەپ و مارکسی بزانێت چاو ئەبڕێتە مارکسیەکانی گەلی سەردەست بە کۆمۆنیست و مارکسی بناسن. بۆیە سەرکەوتنی شۆڕشی کوردستان زۆر درێژەی کێشاوە.

## سەعید سەقزیی:

**•خودموختاریی لە کوێخایەتی زیاتر نیە.**

**•نوچی کۆمەڵە کاتێ دەستی پێ کرد کە بوو بە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران.**

**•کوردێکی مارکسیی چاو ئەبڕێتە مارکسیەکانی گەلی سەردەست بە مارکسیی بناسن.**

*بۆ کورد ژێردەستەیەو ئەبێت لە پاشاگەردانیدا بژی، پرسیارێکە سەعید سەقزیی منداڵ بووە لە بەردەمیدا وەستاوە، بەڵام ئەی ئایا ئەم پرسیارە دواتر سەعیدی بە کوێ گەیاند؟ تەماشاکەن ئەڵێ چی:*

-شۆڕشی تازەی کوردستان لەگەڵ حکومەتی تازەی ئێران کە بەدەس ئیسلامیەکانەوە بوو لە ململانێدا بوو. ئەوانەی کە دەسەڵاتی ئێرانیان بە دەستەوە بوو فەرمانی هێرش و فتوای جیهادی کوردیان ڕاگەیاند. کۆمەڵە بایەخێکی زۆری ئەدا بە شۆڕشی جەماوەریی. ئەم ڕێبازە تازەیەی شۆڕش مەترسی خستە دڵی گروپی ئێران-پەرستەکانەوە. لەم سەردەمەدا بوو کە دەستەیەکی چەند کەسیی بەناوی یەکێتی شۆڕشگێڕانی کۆمۆنیست(اتحادیه مبارزان کمونیست) بە سەرکردەیی مەنسوری حیکمەت خۆیان لە کۆمەڵە نزیک کردەوە، پێشنیاری پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان بە کۆمەڵە ڕاگەیاند. لە گوندێکی سەردەشت بە ناوی "مێشکەیە" حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان پێک هێنا. بۆ فریودانی پێشمەرگەو لایەنگرانی کۆمەڵە کەسێکیان هەر لە کۆمەڵە کرد بە سەرکردەی حیزب، هەروەها ڕێکخراوەی کوردستانی حیزبیان دروست کرد، وتیان لەبەرئەوەی ناوی کۆمەڵە لەناو خەڵکدا خۆشەویستە نازناوی کۆمەڵەی بۆ دیاری ئەکەین. دیارە پێش ئەوەی حیزبەکە پێک بێنن لەناو پێشمەرگەکانی کۆمەڵەدا سەرپێیانە کورتە نەزەرخوازیەک کرا. هەر لەو ماوەیەدا بە شێوەیەکی سیستەماتیک بە دروشمی جۆراوجۆر دڵ و مێشکی پێشمەرگەو لایەنگرەکانی کۆمەڵەیان ئابلۆقە دابوو. کاردانەوەی سیاسەتی داگیرکردن کە پێشتر باسمان کرد، کاری ئەمانەی ئاسانتر کردو کۆمەڵەش زۆر سادە سەیری مەسەلەکەی کرد، بۆیە زوو کەوتە داوی ئەوانەوە. لەو دەمەدا تەنها کاک **خالیدی عەزیزی** پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانی بە زەرەر ئەزانی و نوسراوێکیشی دەربارەی بڵاوکردەوە، بەڵام کەشوهەواکەیان وا پێک هێنا بوو کە نە ئەچووە مێشکی پێشمەرگەکانەوە. لە کاتی نەزەرخوازییەکەدا بە نوسین ئەوەم دەربڕی کە ئەمانەی هاتونەتە کوردستان، لەگەڵ حاکمانی ئێران بۆ شۆڕشی کورد هیچ جیاوازییان نیە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە لەسەر حوکم نین. ئەمانە ئەیانەوێ شێوەی کەمالیستەکان پەیڕەو کەن، ئەمانە دوو مەبەستیان هەیە. یەکەم، کۆمەڵە لە ناوەوە کرمۆڵ بکەن و لەناوی بەرن، دووەم، لەو ماوەیەشدا لە ئیمکانیەتی کۆمەڵە سود وەرگرن. لەو دەمەدا ئەوە ببوو بە خۆراکی پێشمەرگە کە ئەوانەی موخالیفی پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستیی ئێرانن ئەوانەن کە توانای شۆڕش کردنیان نیە و ئەوەیان کردووە بە بیانوو بۆ خۆیان بۆ ئەوەی ئاشبەتاڵی لێ

**عەبدوڵای موهتەدی کە خۆی مەنسوری حیکمەتی هێنایە پێشەوە لەپاش چی ئەڵێ ئەوانە ویستیان کۆمەڵە لەناو بەرن، ئەی ئەو "مەنسوری حیکمەت"ەی نیگەرانی خۆی لە سەربەخۆبوونی کوردستان دەرئەبڕێ ئەبێ کێ بێ؟**



بکەن. پاشان ئایینامەی هێزی پێشمەرگەی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان نوسی. بە منیان ڕاگەیاند: "تۆ چونکە بڕوات بە حیزب نیە ناتوانیت پێشمەرگە بیت" منیش پێم وتن کە من بڕوام بە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران نیە، بەڵام بڕوام بە خۆم و بە شۆڕشی کوردستان هەیە، ئێوە لە ڕادیۆکەتانەوە ئەڵێن ئەوەی ئەیەوێت دژی کۆماری ئیسلامیی خەبات بکات ئەتوانێت بێتە لای ئێمە. گەڕانەوەو تەسلیمبوونەوە بۆ من، کە بە پێی بیروباوەڕێک شارم بەجێ هێشتبوو، ئاسان نەبوو. ئەگەر کۆمەڵە نەبوایە بە حیزبێکی ئێرانیی لە پاکترین هێزەکانی کوردستان نەبوو، قەتیش فەرامۆشم نەئەکرد.

*پاش چەند ساڵێک هەندێک خاڵ لەبەردەمی سەقزییدا تۆخ ئەبێتەوە، ناوبراو ئەڵێت:*

—سێ شت هەیە ئەبێت باسیان بکەم. یەکەم کاک **عەبدوڵا موهتەدی** کە لە کاتی دروست بوونی حیزبدا کردیان بە ڕابەری حیزب و لە لایەنگرە هەرە تێکۆشەرەکانی مەنسوری حیکمەت بوو، لەم ساڵانەی دواییدا ئەڵێت: "ئەوانە، (واتە دەستەی حیکمەت) ئەیان ویست کۆمەڵە لەناو ببەن"(١). لەم بەریشەوە کاک **مەنسوری حیکمەت** لە سەردەمی هێرشەکەی هێزی هاوپەیمانان بۆ دەرکردنی عێراق لە "کوێت"دا، ئەڵێت: "ئەوانە ئەیانەوێ کوردستانی سەربەخۆ دروست بکەن"(٢). بەم پێیە بە ئاشکراو بێ پێچ و پەنا نیگەرانی خۆی لە سەربەخۆبوونی کوردستان دەردەبڕێ. سەیر لەوەدایە کە لە ساڵی ١٩٩٧دا، کەسێک بە ناوی "**ئەویدیپور**" کە لە ئێران-پەرستەکانە ئەڵێت؛ "ئەو کەسەی کە حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانی دروست کردوەو ناوی خۆی ناوە "مەنسوری حیکمەت" ناوەکەی خۆی "**ژووبینی ڕازانی**" یە، نەک مەنسوری حیکمەت. لە کاتی شادا ساواکی ئێران ناردوویە بۆ ئینگلیز"(٣). لێرەدا ئەوە بۆ من گرنگ نیە کە ناوبراو لەگەڵ ساواک بووە یان نا، بەڵکو ئەوە گرنگە کە ئاغای ئەویدیپور بۆچ پاش ١٥ساڵ ئەمە ئاشکرا ئەکات. بەلای منەوە هۆی ئەوەش هەر پەیوەندی بە شۆڕشی کوردستان و یەکپارچەیی ئێرانەوە هەیە. ئاغای ئەویدیپور بۆیە ئەوەی ئاشکرا نەکردووە تا کاکە ژووبین بتوانێ بە جوانیی کۆمەڵە لەناو بەرێت. تا ئێستا مەنسوری حیکمەت ئەوەی باس نەکردووە بۆچی ئەبێ ناوی خۆی لای ئەندام و لایەنگرەکانی بشارێتەوە.

*دەربارەی دیموکراتی بۆ ئێران و خودموختاری بۆکوردستان سەقزیی ئەڵێت:*

—هەر حیزبێکی ئۆپۆزیسۆن خۆی بە لایەنگریی دیموکراتی ئەزانێت، بەڵام کە هاتە سەر حوکم و دەسەڵاتی گرتە دەست کلک و گوێی ئەکات و لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە سنوری بۆ دائەنێت، هەرکەسیش لەو سنورە تێ پەڕی بە تاوانکار دەرئەچێت. با وای دانێین کە ئەو دیموکراتییەی حیزبەکان باوەڕیان پێی هەیە لەو وڵاتانەدا دامەزراو خودموختاریش درا بەکورد. بەڵام مەسەلە سیاسیەکان کە بناغەی حکومەتەکانی لەسەر دانراوە لە ئاڵوگۆڕ دایە. پاش ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بە پێی ڕەوتی مێژووی ناوچەکە بینیومانە، هەر ئەمساڵ خۆزگە بە پار بووە. ئەو حکومەتەی کە تازە هاتۆتە سەرکار ویستویەتی تەواوکەری ئەو کارانە بێت کە حکومەتی پێشوو نەی توانیووە ئەنجامیان بدات. کوردیش ڕیسەکەی ئەبێتەوە بە خوری و ئەبێ سەر لەنوێ دەست پێ بکاتەوە. بۆ بەرەی چەپی کوردستانیش هەر هەمان مەسەلەیە. ئازربیجان یان ئەرمنستان کە لە سەردەمی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا لە سۆڤیەت جیا نەبونەوە، ئێستا ناچارن سەرلەنوێ دەست پێ بکەنەوەو هەشتا ساڵ دواکەوتن. خودموختاریی شتێک لە کوێخایەتیی زیاتر نیە. ئەو حیزبەش کە خودموختاریەکە بەدەست ئەهێنێت ڕۆڵی کوێخای ئاواییەکە ئەگێڕێ و بەس. سەقزیی دەست ڕائەکێشێت بۆ ٣ خاڵی گرنگ کە لەدەستی حکومەتی مەرکەزییدایە: سیاسەتی دەرەوە، سیاسەتی ئابوریی ، پاراستنی سنوری دەوڵەت. لە دوا قسەی دا ئەڵێت: پێویستە بگەینە ئەو قەناعەتەی کە ئێمەش مرۆڤین، لە فارس و عەرەب و ئینگلیز کەمتر نین و ئەتوانین کۆڵی خۆمان هەڵگرین. ئەوانەی بڕوایان بە خۆیان نیە باشترە بیر بکەنەوە لەوە زیاتر زیان لە شۆڕش نەدەن*

١-ل:٧٩،جولای١٩٩٦،ئافاق سۆسیالیزم.

٢-ل:٥٠٠،بحران خلیج و رویدادهای کردستان عراق، انتشارات حزب کمونیست کارگری ایران.

٣-ژ:٤٢٠،ساڵی١٩٩٧ئیمروز.

**مێژووەکە نمونەی ژمارەیەک پارت و ڕێکخراو پیشان ئەدات کە لەسەر حسابی میللەتی کورد یان چینی کرێکار دروست کراون، ئالاو لافیتەی جیاواز جیاوازیان هەڵ کردووە، بڕیاری هەمە جۆرەیان داوە. تا چ ڕادەیەک ئەو ڕێکخراوو کەسانە نوێنەری خەڵکەکانیان بوون، یاخود تا چ ڕادەیەک ویستی ئەوانیان هێناوەتە دی، پرسیارێکە ڕەنگە ئەم جۆرە ستاتستیکە یارمەتی وەڵامدانەوەی بدات.**

**ئەم ستاتستیکە لەناو کۆڕێکدا کراوە، کە کۆمەڵەی کوردستان *ئاوارە*"بە بۆنەی گرتنەوەی هەولێرەوە لە مانگی ١٩٩٦/٩ سازی کردبوو. ئامادەبووەکان بە گوێرەی ئەم ڕێژەسەدییەی خوارەوە لە کوردستانەکانەوە هاتبوون:-**

**باکوری کوردستان (تورکیا): ٣٪**
**ڕۆژهەلاتی کوردستان (ئێران): ١٤٪**
**باشوری کوردستان (عێراق): ٨١٪**
**ڕۆژئاوای کوردستان (سوریا): ١٪**

ئەنجامی سەرژمێرییەکە پیشانی ئەدات کە (٩٧٪)ی پرسیارلێکراوەکان ئەو چوار وڵاتە؛ ئێران، عێراق، تورکیاو سوریا بە داگیرکەر دەزانن. (٨٠٪) چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەی کورد لە دەرەوەی سنوری ئەو وڵاتانەدا دەبینێت. ئەم زۆربەیەش (٧٢٪)ی ڕای وایە هەموو پێکەوە هەوڵ بدەن بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی یەککگرتووی کوردیی و (٢٤٪)یشی ڕای وایە کە هەر بەشێکی کوردستان هەوڵ بدات بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی ناوچەیی خۆی.
ئەو (٢٠٪)ەی کە بڕوای وایە کێشەی کورد لەناو ئەو وڵاتانەدا چارەسەر دەکرێت، (٦٥٪)ی ڕای لەسەر فیدراڵییە، (١٣٪)ەی ئۆتۆنۆمی، (٩٪)ی بڕوای بە چارەسەریی مافی زمان و کولتورەو (١٣٪)ەش نازانێت بە چ شێوەیەک چارەسەر بکرێت باشە.
(٦٩٪)ی خەڵکەکە لای وایە کە ئامانجی پارتەکان ئاشکراو دیاریکراو نییە، بەلام (٢٦٪) لای وایە کە ئامانجیان ئاشکراو دیارە.
(٧٤٪) باوەڕی بە پارتەکان نەماوە کە بتوانن کوردستان ئازاد بکەن و (٢٦٪) باوەڕی بەوە هەیە کە پارەتەکان بتوانن کودستان ئازاد بکەن.
دەربارەی جیاوازیی لە نێوانی پارتەکاندا، (٣٤٪) هیچ جیاوازییەک لە نێوانیاندا نابینێت، (٣٣٪) جیاوازییەکی کەم دەبینێت، (٣٣٪) جیاوازییەکی زۆر دەبینێت.
دەربارەی ڕێککەوتنی پارتی لەگەڵ حکومەتی عێراقداو هێنانەوەی سوپای عێراق بۆ کوردستان، وەلامی خەڵکەکە ئاوایە: (٧٩٪) بە خیانەتی دەزانێت، (٩٪)ی نازانێت خیانەتە یان نا؟ بەلام (١٢٪)ی دەڵێت نەخێر، خیانەت نیە.
(٥٣٪) بوونی ئەڵتەرناتیڤێکی سیاسی لە جێگای ئەم پارتانەدا بە پێویست دەزانێت. (٢٣٪) بە پێویستی دەزانێت بەلام نازانێت بە کام شێوە دەبێت. بەلام (٢٢٪) دەڵێت؛ نەخێر ئەڵتەرناتیڤی دیکە پێویست نیە.
(٨٥٪) بوونی ئایدۆلۆژیەک بۆ دیاری کردنی ئامانجی هەر ڕێکخراوێکی سیاسی بە گرنگ دەزانێت. (١٠٪) بە گرنگی نازانێت و (٥٪)یش نازانێت.
(٧٩٪) بوونی ناسیونالیزم، وەک ئایدیۆلۆژییەکی سیاسی لە کاتی ئێستادا بە گرنگ دەزانێت، بەلام (١٢٪) بە گرنگی نازانێت و (٩٪)ش وەلام: نازانم.
(٨٩٪) بوونی دەوڵەتی ناسیونالی کورد بە پێویست دەزانێت، (٤٪) بە پێویستی نازانێ و (٧٪) نازانێت*

## زۆربەی پرسیارلێکراوەکان

**•ئەو وڵاتانە بە داگیرکەر دەزانن.**
**•چارەسەری کێشەی کورد لە دەرەوەی سنوری وڵاتەکانە.**
**•بڕوای بە پارتەکان نەماوە کوردستان ڕزگار بکەن.**
**•هێنانەوەی سوپای عێراق لە لایەن پارتییەوە خیانەتە.**
**•بوونی ناسیونالیزم ئێستادا گرنگە هەبێت.**

## ئەوەی تۆ ئەتەوێت ئەوەیە ئەبێت خۆت بیکەیت

**تۆ ئەگەر لات وایە ئەم دنیایە بە تۆ ناگۆڕێت، لاشت وا نەبێت ناشتوانیت لە پڕۆژەی گۆڕانیدا لەگەڵ بیت.**
**ئەگەر "کۆنتراکت" قسەی دڵی تۆیە، دەسەوسان دامەنیشە! چونکە ئەوانەی نوێنەری ئەم ڕۆژە ڕەشەن کەمتەرخەمیی لە پاراستنی ئەم بارە ناهەموارە ناکەن کە تۆشی تێ کەوتوویت:**
**•بەژداریی لە "کۆنتراکتدا" بکە!**
**•بڵاوی بکەرەوە!**
**•بە دەنگی خۆتی بزانە!**
**•با بزانین بە هەمووومان ناتوانین چی بکەین؟**

# فوتبۆڵ و ئەژنۆیەکی تەقیوو

## سویدم زۆر لا خۆش بوو

من ناوم ئاگرین وەهابە. تەمەنم ١٥ساڵە. لە کوردستانی عێراقەوە هاتووم. لە وڵاتی خۆمان شەڕ هەبوو، بۆیە بڕیارمان دا کە بڕۆین بۆ شوێنێکی تر کە دور بیت لە شەڕ و ئاژاوە.
بەڵام پاش دوو مانگ کە لە سوید بووم، ڕۆژێک ئەچوم بۆ مەکتەب، دوو کوڕی بیست ساڵ بانگیان کردمە ناو دارستانێکەوە، لەوێ ٦ چەقۆیان لێ دام و هەموو گیانیان کردم بە خوێن و ڕایان کرد.
ئاگرین ئەڵێت: پاش مانگ و نیوێک، هەر لە شاری نینیسهامن، ئێوارە بوو، ویستم بچم بۆ ماڵی ڕەفیقێکی باوکم، لە ڕێگا نزیکەی دە کەس هاتن بۆم و ٦٠-٧٠ چەقۆیان لێ دام. خەریک بوو بە زنجیر بمخنکێنن، بە هەر جۆرێک بێ ڕام کرد لە دەستیان بەڵام هیچ شوێنێک نەما لە گیانم کە چەقۆی بەرنەکەوێ.

## سویدم بەتەواوی لا ناخۆش بوو

چونکە لەگەڵ ئەو هەموو شەڕوشۆڕەی وڵاتی خۆم، قەت نەمبینی بوو کە منداڵێکی وەکو من ئاوای لێ بکرێت. ئیتر بۆم دەرکەوت کە هەموو وڵاتێک پیسەو شەڕی تیایە. وڵاتی خۆم لێرە باشتر بوو چونکە ١٥ساڵ لەوێ ژیام قەت شتی وام بەسەر نەهاتووە، نەم دیوەو نەم بیستووە.
من لە وڵاتی خۆم یاریزانێکی باشی فوتبۆڵێن بووم، کەچەندین مەدالیام وەرگرتووە، چەندین جار ناوم لە ڕۆژنامەدا دەچووە. بەڵام ئێستا بەبۆنەی ئەو دوو ڕوداوەوە کە هەر دوو جارەکە بە قۆنەرەی ئاسنەوە دایان لە ئەژنۆم، ئێستا ناتوانم یاری بکەم.

## سەرکردەی حیزبەکان بە حوکمی یاسر عەرەفات



یاسر عەرەفات دەربارەی کوشتنی ئەو فەلەستینیانەی کە زەوی خۆیان دەفرۆشن بە جولەکە دەڵێت: "ئەوە ماف و ئەرکی خۆمانە بەرگریی لە وڵاتی خۆمان بکەین" یاسر ئەو زەوی فرۆشانە بە خائین دائەنێت. لە مانگی (٥)ی ئەم ساڵدا فەرمانبەرێکی حکومەتی فەلەستینی ڕای گەیاند کە هەرچی خەریکی ئەم ئیشە بێت حوکمی کوشتنی لەسەرە. تا ڕۆژی ٢١/٥/١٩٩٧ کە ڕادیۆی ئیسرائیلیی ڕای ئەگەیەنێت کە دەڵاڵێکی تری زەوی فرۆشتن بێ سەروشوێنە، مەیتی دوو زەویفرۆشی فەلەستینیی دۆزراوەتەوە(#).
لە فەلەستین، پارچەیەک زەوی فرۆشراو حوکمی کوشتنی لەسەرە.
بەڵام لە کوردستان، چونکە حوکم بەدەست فرۆشیارەکەوەیە:-
فرۆشراو: هەموو نیشتیمان.
حوکمدراو: هەموومان.

(#)ئۆ.ئێن.تێ،٢٢ . ٥ . ٩٧. وێنە: المجلە

ئاگرین ٩/١٩٩٦ هاتۆتە سوید، ڕوداوی یەکەم ئەکەوێتە مانگی ١٢وەو دووەم مانگی دوو. ئاگرین لەوە دەچێت کەوتبێتە بەر شاڵاوی ڕەگەزپەرستەکان. ئەمانیش ئیشیان بەوە نیە چۆن بیر دەکەیتەوە، ئەوە بەسە کە تۆ قژت ڕەشە، یەکێک نیت لە ڕەگەزی ئەوان*

# ئەوەی ئێمە لێی هەڵدێین دواڕۆژی منداڵەکانمانە



کوردستان جێ هێشتن و لە ئەوروپا گیرسانەوە ڕەنگە دوا قۆناغی ژیانی ئێمە بێت. بەڵام منداڵەکانمان ئەخاتەوە بەردەمی یەکەم پرسیار: ئێمە کێین؟ بۆ هەموو هاوڕێکانی دەوروبەرم، فارس، تورک، پۆڵۆنی، شیللی ئاڵایان هەیە من نیمە؟ ڕێناس کە ١٧ساڵە یەکێکە لەوانەی کە لە بەریتانیا گەورە بووە، بەڵام بلیتی یەکسەریی ئەکرێت و ئەگەڕێتەوە بۆ نیشتیمانەکەی خۆی. ڕێناس بەوە ناڕوخێت کە بێگانە دەرهەقی ئەکات، بەڵام ئاخۆ ئەو دەستە کوردییە چۆن ببینێت کە ئێمەشی گەیاند بەم دەردەی ئەمڕۆ؟
ڕێناس: نۆ مانگ لە چێشتخانەیەک کارم کرد بۆ ئەوەی پارەی سەفەرێک کۆکەمەوەو بگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆم؛ کوردستان. بلیتێکی یەکسەرییم کڕیی و مانگی ٦ی ١٩٩٧

# تورکیا بەتەمایە چی لە باشوری کوردستان بکات؟

## عیسمەت قۆجاغ: نابێت بەم ناوچەیە بوترێت کوردستان

**عومەر نوری قادر**

هاتوچۆی تورکیای حیزبەکان ژمارەی تورکمانی کوردستانی عێراقی لەسەر کاغەز بەرز کردۆتەوە. ژمارەیەک کورد لەژێر فشاری برس و کارگرانییدا خۆیان بە تورکمان ئەنوسن. تورکیا لە ڕێکخستنەوەی حیزبەکاندا گروپی تورکمانیی ئەکات بە چاودێری ڕێکەوتنەکانیان. ئەمڕۆ چەند پارتێکی تورکمانیی لە هەولێردا کار ئەکەن، لەوانە:

١-بزووتنەوەی سەربەخۆیی تورکمان، بە سەرۆکایەتی فەرید چەلەبی.

٢-پارتی نەتەوەیی تورکمانی، بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال یایجیلی.

٣-پارتی یەکێتی تورکمانی، بە سەرۆکایەتی ئوغوز کور کور.

ئەم پارتانە بەرەیەکیان لە نێو خۆیاندا دروست کردووە بە ناوی "بەرەی تورکمان"ەوە، ژمارەی ئەندامی هەموو بەرەکە، بە پێی ڕۆژنامەی (شرق الاوسط)ی ڕۆژی ١٩٩٧/٣/٢٤، ئەگاتە ٤٠٠کەس. سەرۆکی ئەم بەرەیە ناوی "عیسمەت قۆچاغە" و هەمان ڕۆژنامە چاوپێکەوتنێکی لە ئەنقەرە لەگەڵ کردووە. لە وەڵامی یەکێک لە پرسیارەکاندا بەم شێوەیە وەڵام ئەداتەوە: "کەرکوک بەشێکە لە باکوری عێراق، ناوچەی باکووری عێراقیش هەر بە تەنیا کوردی تێدا نیە، بەڵکە تورکمان، ئاشوریی، زێبارییی، یەزیدیی و عەرەبیشی تێدا دەژی. لەبەرئەوە نابێت بەم ناوچەیە بوترێت کوردستان، بەڵکە باکوری عێراقەو کەرکوکیش شارێکی باکوری عێراقە. عیسمەت بەردەوام ئەبێ و ئەڵێت: "مەسەلەی جیابونەوەی باکووری عێراق، مەسەلەیەکە نابێت ڕوبدات. بەرەکەمان باوەڕی بە یەکێتی خاکی عێراق هەیە".

عیسمەت قۆجاق و بەرەکەی کە ٤٠٠ کەسن، لەناو خاکی کوردستانەوە دەنگ بەرز ئەکەنەوەو کوردستان بە نەبوو دادەنێن و دژی جیابونەوە لە خاکی عێراق ئەوەستنەوە. بەعسیەکان لە بەغداد دەربارەی ئەم گروپە تورکمانیانە بەدەنگ دێن و لە ڕۆژنامەی (العێراق، ڕۆژی ١٩٩٧/٣/٢٦)دا، دەڵێن: "ئەنقەرە هەولێر دەکات بە شارێکی تورکیی، قوتابخانەی تورکیی دەکەنەوە بۆ بەتورکردنی کورد. قوتابخانەکان لە هەولێر سرودی تورکی بە گیانی کەمال ئەتاتورکدا دەڵێن و وێنەکەیان بە پۆلەکانی هەندێ لە قوتابخانەکاندا هەڵ واسیووە. چەکدارە تورکمانەکان شەو و ڕۆژ، لەبەر ئەوەی چاودێریی لە تەقەوەستان دەکەن لە نێوان ڕێکخراوە کوردییەکاندا، بە شەقامەکانی هەولێردا دەگەڕێن."

ئەم گروپانە لە ئێستادا هیچ نین بەو شێوەیە دەدوێن، ئەگەر لە داهاتویەکی نزیکدا دەسەلاتێکی زیاتریان بکەوێتە دەست، دور نیە بکەونە ئەنفالکردنی ئەو کوردەی کە تا ئێستا لە کەرکوکدا دەژی*



وێنەی کوردێکی کوژراوی ڕاکێشراو

لە لایەن سوپای تورکیەوە

سواری فرۆکە بووم بۆ تورکیا بۆ ئەوەی لەوێوە بچمەوە بۆ نیشتیمانە ئەسڵییەکەی خۆم. لە دیاربەکرەوە (١٠٠) پاوەندم دا بە تەکسی و (٦) سەعاتی خایاند تا گەشتینە سەرسنور. لەوێ کە پەساپۆرتەکەم پیشان دا ئەفسەرەکە سەری هەڵبڕی و وتی: "کوردستان چیە!" زانیم مەبەستی ئەوە بوو کە شوێنی لەدایکبوون نوسرابوو: کوردستان. نەی هێشت لە سنور بچمە ئەودیوەوە.

کەوتمە تەلەفون لەگەڵ سەفارەتی بەریتانیی لە تورکیا. پێیان وتم ماوەیەکی تر تەلەفون بکەمەوە. کە تەلەفونم کردەوە وتیان: "هیچ نیە ئەتوانیت بیەڕیتەوە، قسەمان لەگەڵ ئەفسەری فەرماندە کردووە وتویەتی با بێت بۆ لام، ئەگەر پەساپۆرتەکەی هەڵەیەکی تیا نەبێت بۆی هەیە بڕوات."

چوم بۆ لای ئەفسەرەکەو پەساپۆرتەکەم پیشان دا. ئەفسەرەکە وتی: "ئەم پەساپۆرتە ڕێگا نادرێت، چونکە لە شوێنی لەدایکبووندا نوسراوە: کوردستان، بڕۆ کوردستانەکە لابەو وەرەوە". ئەفسەرەکە پێی ڕاگەیاندم کە حکومەتی تورکیی دان بە کوردستاندا نانێت و کوردستان وەکو وڵاتێک بوونی نیە.

جانتام کۆکردەوەو ناچار (١٠٠) پاوەندی ترم دا بە تەکسی بۆ گەڕانەوەیەکی (٦)سەعاتی تر، بۆ دیاربەکر. ئەمە بە مەرجێک ساڵی ١٩٩٤ و ساڵی ١٩٩٥ بە هەمان پاسپۆرت گەڕابومەوە بۆ کوردستان. دوای مەسرەفێکی زۆرو ماندوبوون و نارەحەتیی بە دڵشکاوییەوە گەڕامەوە بۆ بەریتانیا، کە گەشتمەوە بەریتانیا کەس ڕای نەگرتم لەسەر ئەوەی لەسەر پاسپۆرتەکەم نوسراوە: **کوردستان***

**ڕێناس** ١٩٩٧/٧، لەندەن

# ئەدیبە ناسراوەکانی دنیا لە گێژاوی ڕوداوەکاندا!

**بەمۆ کەمال**


Salman Rushdie.


Slavenka Drakulic.

## سەلمان ڕوژدی: کاتێک ئەدەب لەگەڵ سیاسەتدا بەیەکدا دێن، مەترسی ئەوەی لێ ئەکرێت ببێت بە شتێکی ڕۆژانە.

**سەلمان ڕوژدی** دەربارەی ئایەتە شەیتانیەکان دەڵێت حسابی سیاسیم کەمتر کرد بوو بۆ ئەم کتێبەم، چاوەڕوانی ئەوە نەبووم ڕۆژێک دێ ئەبێتە هۆی ئەم هەموو گێرمەوکێشەیە. کاتێک لە "منداڵەکانی نیوەشەو"دا ڕاستەوخۆ ڕەخنە لە "**ئەندیرا گاندی**" ئەکرێت، ئەنجامەکەی بەوە ئەشکێتەوە کە ئەندیرا بەرەنگاری ببێتەوە، یەکسەر وەڵامی بداتەوە. سەلمان ئەڵێت ئەو ساتە لەوە گەیشتم کە چۆن و لە کوێوە لە بنی هەمانەکەم داوەو پێکاومن. دەربارەی کتێبی ئابڕوچونیش سەلمان بەلایەوە کتوپڕیی نەبووە ڕژێمی "پاکستان" ی ئەوسا بەرپەچی بدەنەوەو بەرەنگاریی ببنەوە.
سەلمان ڕوشدی دژی ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ داوا لە نوسەر بکرێت چۆن و لەبارەی چیەوە بنوسێت. لای وایە کە ئەدەبی ڕەسەن ئەکەوێتە مەترسیی گەورەوە کاتێک کە سیاسەت دێتە ناوەوە. یەکێک لەو مەترسییانە ئەوەیە کە کاتێک مرۆڤ بە هیوای ئەوەیە کە ئەدەبەکە نرخێکی هەمیشەیی هەبێت کەچی ئەو کاتیی بێت. بەڵام لەگەڵ ئەو مەترسیانەشدا ڕوشدی پێی وایە کە خۆدزینەوە لە سیاسەت زەحمەتە.

**دراکۆلیک** ڕۆژنامەنوس و ئەدیبێکی کرواتییە، دوای دەرکردنی کتێبی: باڵکان ئێکسپرێس (ساڵی ١٩٩٢) بە خاین، جادوگەر و خراپەکار تاوانبار کرا. دواتر ئەڵێت: "مەرج نیە داوا لە ئەدیب و هونەرمەند بکرێت لەسەر کارەساتی جەنگ بنووسێت. من وەکو تاقیکردنەوەی خۆم بۆم دەرکەوتووە کە ئێمە بەرەو ڕوی دوو بڕیارو دوو هەڵوێستی کوێرانە دەبینەوە، یەکەمیان ئەوەیە نوسەر دەکرێتە نمونەی سوپەرمۆڕالیستێک و لە کەسانی ئاسایی جیا دەکرێتەوە. دووەمیشیان بڕواهێنانێکی ساکارانەیە بە ڕاستی و زانست و ڕێنمایی کردنی خەڵکیی بەوەی ئەگەر مرۆڤ هەست بە ڕاستی شتێک بکات، هەوڵ بدات کەسانێکی تری پێ ڕێنمایی بکات، ئەم کارە دەبێتە مایەی گۆڕانکاریی و گەشەکردن و بەرەو پێشەوەچوونی کۆمەڵ. ئەم بڕواهێنانە بە دەسەڵاتی وشە ئەگەڕێتەوە بۆ بیروڕا جیاوازەکانی نەریتی ئەوسای کۆمەڵ".
سلاڤینکا ئەڵێت لەگەڵ ئەوەدا کە ڕۆژانە کارەساتی جەنگی یۆگۆسلاڤیا ئەبینرا، باس ئەکراو کارە نامرۆڤانەکانی سیاسیەکان ئەخرانە بەرچاو، کەچی لە هەمان کاتدا هۆنراوەو گۆرانی بەسەر سەرۆک و خوێنڕێژەکانیشدا هەڵ ئەدراو بە شانوباهوی سوپادا ئەهاتن. ئەم خانمە ئەڵێت: "دوای دەرکردنی کتێبەکەم بۆم دەرکەوت نوسینی بابەتی سیاسی تەنیا بەلای نوسەرەکە خۆیەوە نەبێت گرنگە، بەلای خەڵکییەوە پوچ و بێمانایە. لەمەدا لەو ڕاستییە گەیشتم کە هەرچییەکم نوسیووە هێندەی تاڵە موویەک کاری نەکردۆتە سەر بارودۆخی جەنگەکە، ئیتر لەوە گەڕام خۆم لە نوسینی بابەتی سیاسی بدەم". خانمی سلاڤینکا ئەگاتە ئەوەی بڵێت: "وتەکانی من هیچ مانایەک نادەن بەدەستەوە، کەس پەیڕەوییان ناکات.. ئەمەش بۆ من نەمان و لەناوچوونە".

## سلاڤینکا دراکۆلیک: کەس باسی ئەوەم بۆ ناکات من چی بکەم، کەس، کەس کەس. ئەوە ئازادیی خۆمە، ڕابوونی خۆم.

ڕوداوەکان ئەبنە هۆی ناڕەحەتیی دەروونی بۆی، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەم تاقیکردنەوانە ئەبنە مایەی خۆدروستکردنەوەیەکی تر لەناو خودی خۆیدا. سلاڤینکا ڕای وایە ئەگەر نوسینەکانی یارمەتی کەسێکی دابێت ئەوا خراپ نین، ئەگەر نا ئەوا بۆ خۆی نوسیون و بەس. سلاڤینکا لەبەردەمی پێچەوانەی قسەو نوسیندا تەسلیم ئەبێت، ناوبراو ئەڵێت: "چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بینیم کە چۆن پیاوێکی ڕۆژنامەنوس چووە سەرایڤۆ و کچەساوایەکی حەوت ڕۆژەی لە مردن ڕزگار کردو لەگەڵ خۆیدا بردی و کرتیە خۆی، یەکسەر هەستم بە بێ نرخیی و نەبوونیی خۆم کرد. کاتێک ئەبینم یەکێک بە ڕاستی یاریدەی یەکێکی تر ئەدات، یەکێکی زیندوو ئەبێتە هۆی گۆڕانی ژیانی یەکێکی نیوەمردوو، ئیتر لە بەرامبەر ئەم جۆرە



Orhan Pamuk.

**ئۆرهان پاموک: دەنگی ناوەوەی خۆت حسابە. ئەمە تەنها شتە بۆ ئەدیب کە بەلایدا بیشکێنێتەوە.**

هەڵوێستانەدا نوسینەکانم هیچ نرخێکیان نامێنێت. سلاڤینکا لای وایە کە دەبوو نەترسترو خاوەن هەڵوێست بوایە، بە کردەوە نەک هەر بە نوسین شتی لێ بوەشایەتەوە. ناوبراو ئەڵێت: "من بەشبەحاڵی خۆم ناتوانم ئیتر وا بەردەوام بم، بنوسم لە کاتێکدا بزانم نوسینەکانم هیچ کەڵکیان نیەو هاریکارییەک لەم ڕووەوە ناکەن. من ئەبوایە لەبری ئەمانە شتێکی ترم بکردایە، شتێکی زیاتر،..ئا ئەمانەیە لە ناوەوە ئەم خۆنەوەو بەردەوام ئازارم ئەدەن.

**ئۆرهان پاموک** ئەدیبێکی تورکە کە دژی چەوسانەوەی کوردە لە وڵاتەکەی خۆیدا؛ تورکیا. ناوبراو ئەڵێت ئەوەی کە ئەدیبێک یان ڕۆژنامەنوسێکی نەناسراو لە تورکیادا ئەبێت لێی بترسێت ئەوە نیە کە بکەوێتە بەرشاڵاوی تۆڵە یان بکەوێتە بەندیخانەوە، بەڵکو ئەوەیە کە لە لاکۆڵانێکدا بدرێتە بەر گولله. ئەمەیە تەشقەڵە گەورەکە لە باسی ئازادیی ڕادەربڕیندا لە تورکیا. ئەوانەی لە دەرەوە ئەڕواننە تورکیا وا ئەزانن کە ئەبێت خەباتی "ئازادیی ڕادەربڕین" و خەباتی دژی "ئیسلامیە توندڕەوەکان" دەست لە دەست شان بەشانی یەک بڕۆن. هەرچۆنێک سەیر بێ با ببێ بەڵام هەر یەکێک لەوان نەبەستراوە بەوی تریانەوە. ئۆرهان ئەڵێت وردە وردە تێ گەشتم کە ئەم خەباتە بۆ ئازادیی ڕادەربڕین، لە ڕوی سیاسیەوە، ئیسلامیەکان خستیانە دەستی خۆیانەوە. ئەوان بۆ بردنەوەی دەنگ قۆستیانەوە. دوو هەست و ڕای لەگەڵ یەکنەهاتەوەم لە ناو خۆمدا بینیەوە. یەکەمیان ئەو بۆچونە سیاسیەیە کە مرۆڤ ئەبێت بە هەموو ئەو دەستیاوە دیموکراتیانەی ئەلوێت دژایەتی ئیسلامیە توندڕەوەکان بکات، وتار بنوسێت و بەشداریی شەڕی سیاسی بکات. دووەمیان کە هیچ پەیوەندییەکی بە یەکەمەوە نیە، ئەوەیە کە ئازادیی ڕادەربڕین ئەبێت بپارێزرێت. وای بۆچوم کە لەم حاڵەتەیاندا ئەبێت ئاکامە سیاسییەکانی ئەم خەباتەیان بخەمە ئەو لاوە. ئۆرهان پاموک دەربارەی کتێبەکەی سەلمان ئەڵێت: "من وەکو ئەدیبێک ئاسان بوو بەرگری لە کتێبەکەی سەلمان بکەم، چونکە بەرگرییم لە داهاتوی خۆم کرد. بەڵام وەکو مرۆڤێک چی بکەم کاتێک کە مەترسی گەشەکردنی ئیسلامیە توندڕەوەکان وەکو هەڕەشەیەکی گەورە دێتە بەردەمم؟

**داڤید گرۆسمان:** ئەدیب و ڕەخنەگرێکی ئیسرائیلیی ناسراوە. دەربارەی دەوری نوسین باسی ئەو فەلەستینیە دەهێنێتە پێشەوە کە سەربازێکی ئیسرائیلیی ئەگرێت و مەجالێک ئەدات بە حکومەتی ئیسرائیل کە ئەگەر لە ماوەی ٢٤سەعاتدا لە ناوچە داگیرکراوەکان نەگەڕێنەوە ئەم سەربازەکە ئەکوژێت. داوای فەلەستینییەکە منالانەو



David Grossman.

**داڤید گرۆسمان: ئەگەر مرۆڤ باسی واقیعەکە نەکات، ڕۆژێک بەسەر واقیعێکدا خەبەری ئەبێتەوە کە ناتوانێت وەسفی کات.**

ساویلکانەو نا لۆژیکییە. چونکە ئەمە فشار نیە بۆ گەڕانەوەی سوپایەک لە ناوچەیەکی داگیرکراو. داڤید هەمان منالانەیی لای ئەدیب بەوە ئەدۆزێتەوە کە ئەدیبێک بە گێڕانەوەی بەسەرهات بیەوێت شتێک بگۆڕێت. داڤید گرۆسمان یەکێک بووە لەو کەمانەی کە مەترسی ئەوەی کردووە کە ئەگەر ئەوەندە سەیری فەلەستینی بە دوژمن بکرێت ڕۆژێک کە چەرخەکە گۆڕاو تەباییەک هاتە پێشەوە بەسەر واقیعدا ئەکەوون کە پێچەوانەی ئەوەیە کە باس کراوەو سەریان لێی دەرناچێت.

داڤید ئەڵێت ئەدیبی ئیسرائیلیی هەر جۆرە بابەتێک بنوسێت کە هاتە دەرەوە پرسیاری سیاسەتی لێ ئەکرێت*

سەرچاوە:داگنس‌نیهێتەر،ڕۆژی:١١، ٢، ١٩٩٦

***پاشماوەی چاوپێکەوتنەکەی شێرکۆ بێکەس:***

بەرنامەی سیاسی و کۆمەڵایەتی چەندین ساڵەی ئەو کەسانە خۆیانە. هەموو ڕێبەرێکی سیاسی بەرلەوەی بۆ خۆی بژی بۆ خەڵک ئەژی. ڕەنگە بۆ کەسێکی ئاسایی کە ئەرکی گەورەی سیاسی لە ئەستۆدا نەبێ و لە شوێنێکدا نەبێ کە وەک نمونە تەماشا بکرێ، ئەشێ لەو حاڵەتەدا بوترێ ئەمە بڕیارێکی تایبەتی مەسەلەیەکی شەخسی یە پەیوەندی بە ژیانی تەنها ئەو کەسە خۆیەوە هەیە. بەڵام بۆ ڕێبەرە سیاسیەکان مەودای حەزو ئارەزوە تایبەتیەکان زۆر تەنگ ئەبێتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە ئەبینیت خۆشەویسترین سەرکردەو ڕێبەری سیاسی لە ناو خەڵکیدا هەمیشە ئەو کەسانە بوون کە کەمترین بەشی ماڵیی دنیاو حەزو ڕابواردن و خۆشییان بۆ خۆیان ویستوە. ئەمە جگە لەوەی دیاردەی وا، بە زەقی دورکەوتنەوەی ژیانی ئەو کەسانەو خەڵکە بێ دەرمتانەکە ئەخاتە ڕوو کە دیارە ئەمەش ئەبێتە مایەی تیروتوانج و سەرزەنشتیی ناو خەڵکەکە. ئەو برادەرانە من بە هاوڕێ و دۆستی و نزیک و خۆشەویستی خۆمیان ئەزانم و هەموشیان خاوەنی ڕابووردوی پڕ لە تێکۆشان و ڕەنج و خەباتی لەبەرچاون. بەتایبەتی لە سەردەمە هەرە تاریکەکانی دوای هەرەسی ساڵی ١٩٧٥دا ئەو کەسانە ڕیزە چرایەکی ئەو مێژووە بوون. بەڵام ئا لەم نوقتەیەدا پێیان ئەڵێم: هەڵەن و ڕەخنەیان لێ ئەگرم*

١٩٩٧/١٠/٢٩

# شێرکۆ بێکەس ئۆکتۆبەری ١٩٩٧ ئەڵێ چی!



**•دەنگ بدەن بە سەوز!**
**•ی.ن.ک بۆ مەسەلەی کوردو مرۆڤی کورد تێ دەکۆشێت**
**•باڵای خیانەتی "کیسلینگ"ی نەرویجی لە باڵای خیانەتی "مەسعود"ەکەی ئێمە کورتترە**
**•شەڕی یەکێتی و پارتی شەڕی بەرەی گەل و بەرەی دوژمنە**
**•ژنبەسەراهێنانی سەرانی یەکێتی شەخسی نیە**

**پ١:** ساڵی ١٩٩٢ ئەتووت: دەنگ بدەن بە سەوز! ئەی ساڵی ١٩٩٧ لەم سیانە کامیان هەڵ ئەبژێریت: ١- دەنگ بەن بە سەوز! ٢-دەنگ بدەن بە زەرد! ٣-دەنگ مەدەن بە کەسیان!

**شێرکۆ بێکەس:** بە پێی ئەو دابەشکردنە، من نە "بێ دەنگیی" هەڵ ئەبژێرم و نە پاڵێوراوانی حیزبی (٣١)ی ئابیش. لەبەرئەوە من هەر ئەڵێم: دەنگ بدەن بە سەوز!

**پ٢:** ئایا تۆ ئەندامی یەکێتی نیشتیمانیت؟

**ش.بێکەس:** من ئەندامی نێو شانە و ڕێکخراوو ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان نیم. بەڵام بە ڕادەی نزیکیی دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی، بێ دەمامک پۆشین و ڕیایی کە نزیکەی بیست ساڵێ پەیوەندی دڵسۆزانەی نێوان چەندین ئەزموونی جۆربەجۆریان لە بەیندا بێ، بەو ڕادەیە لێیان نزیکم.

**پ٣:** ئەتوانیت ڕوو بکەیتە خەڵکیی و بڵێی: یەکێتی نیشتیمانی بۆ مەسەلەی کوردو مرۆڤی کورد تێ دەکۆشێت؟

**ش.بێکەس:** بێگومان ڕوو ئەکەمە خەڵک و ئەوەیان پێ ئەڵێم کە ئێوە نوسیوتانە. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوەشم لە بیر ناچێ کە باسی هەڵەو خەوش و کەم و کوڕی و خەتاکانی یەکێتی نیشتیمانیشیان بۆ بکەم و لێ یان نە شارمەوە. چونکە بەلای منەوە مێژووی ڕووناکیان لە تاریکیان دیارترو لەبەرچاو ترەو لەمپەڕی دنیاشەوە تا ئەو پەڕی نە چەمی سیاسەتی بێ چەقەڵ هەیەو نە حیزبی یۆتۆپیا و بێ خەوشیش.

**پ٥:** پارتی ١٩٩٦/٨/٣١ حکومەتی عێراقی هێنایەوە بۆ کوردستان، ئایا ئەمە خیانەتە؟

**ش.بێکەس:** بەلای منەوە هێشتا ناووناتۆرەی "خیانەت" پڕ بە پێستی ئەو کارە دزێوو دەغەزارەی پارتی نیەو بە بەری ڕۆژی ٣١ی ئاب تەسکەو کورت و کوێر. "ئەبو ڕوغاڵ"ی عەرەب و "کیسلینگ"ی نەرویجی و "فیشی"ی فەرەنسی، ئەو نمونانەن کە لە مێژووی خیانەتکاریدا زۆرجار باسیان لێوە ئەکرێ، بەڵام لەچاو "مەسعود"ەکەی ئێمەدا پچوکترن!

**پ٦:** ئایا بەرەیەکی تر هەیە کە بەرەی میللەت بێت و یەکێتی نوێنەرایەتی بکات؟

**ش.بێکەس:** لە دوای ٣١ ئاب و ١٤ەی ئایارو ئەم ڕۆژگارانەی ئێستاش، شتێک نەماوە پێی بوترێت شەڕی ناوخۆ و براکوژیی. ئێستە شەڕ، شەڕی نێوان کوردو داگیرکەرانێتی، شەڕی نێوان بەرەی گەل و دوژمنانە، شەڕی نێوان لەشکری سەددام و پێشمەرگەو لەشکری ئەتاتورک و لەشکری گریلاکانە. لەبەرئەوە من پێم وایە ئەم بەرانە تەم و مژیان بەسەرەوە نەماوە. ئێستە لە خوارووی کوردستاندا، دوای هاتنی تانک و تۆپ و دەبابەکانی سەددام، فڕۆکەکانی تورکیا، دروێنەی گیانی خەڵک و پێشمەرگ ئەکەن. بەم پێیە سەنگەرەکان؛ بەرەکانی خۆیان یەکالا کردۆتەوە. هەموو دەمامکەکان کەوتونەتە خوارەوەو دەم و چاوەکان بە هەموو حەقیقەتەکانی خۆیانەوە، ڕەش و سپی، کەوتونەتە ڕوو. لەم لاوە: بەرەی یەکێتی و هەموو ئەو حیزب و ڕێکخراوە نیشتیمان پەروەرانەی کە نەبوونەتە کەوا سوری بەر لەشکری دوژمن. لەولاشەوە: بەرەی دوژمن و پارتی بە هێزی عێراق و تورکیاوە. هەڵبەت نوێنەرایەتی کردن و نەکردنیش، ئەوە پەیوەندی بە تەرازووی هێزەکان و قورسایی هەر یەکێکیانەوە هەیە لەسەر ڕوداوەکان و لە مەیدانی بەرەنگاربوونەوەی دوژمناندا. هەر لەبەر ئەوەیشە کە ڕەنگە یەکێتی لە نێو ئەو بەرەی گەلەدا، لەهەمووان بە تواناتربێ بۆ ئەم نوێنەرایەتی کردنە.

**پ٧:** چەند کەسێک بە پرۆسەی ئەنفالدا ڕۆشتن و دەرباز بوون، لەوانە "**تەیمور**" ئایا قەت تەیمور یان یەکێک لەوانت دیووە؟ ئەگەر نا چیان گێڕایەوە؟

**ش.بێکەس:** نەخێر، من بۆ خۆم هیچ کەسێکم لەو بەسەرزیندوانەی کە لە کاروانی مەرگی ئەنفال، ڕزگاریان بووبێ، نەدیوە. نە تەیمورو نە کەسێکی دیکە. تەنها هەر لە ڕێگەی خوێندنەوەوە گوێم لە چیرۆکە ترسناک و تراژیدیەکانیان بووە.

**پ٨:** ئەو کاتەی وەزیری ڕۆشنبیریی بویت وەزارەتەکەت هیچ پرۆژەیەک، نەخشەیەک، کارێکی ئەنجام داوە پەیوەندی بە ئەنفالەوە بێت و لێرەدا بۆ خوێنەرانی باس کەیت؟

**ش.بێکەس:** بە پێی دابەشبوونی کاروبارو پسپۆڕیی هەر وەزارەتێ کە لە ڕووی قانونی و ئیداری یەوە بۆی دیاری کرابێ، ئەو مەسەلەیە و جێ بەجێ کردنی ئەو نەخشەو پرۆژانە پەیوەندییان بە ئەرکەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە نەبووە. بەڵام ئێمە لە بواری هونەری و ڕوناکبیریدا، سەرپەرشتی هەموو ئەو پێشنگای وێنەو کۆڕو کۆبونەوەو سیمینارانەمان کردووە کە مێژووی ئەو کارەساتە گەورەیەیان نیشانداوە.

**پ٩:** ژمارەیەک لە سەرانی یەکێتی ژنیان بە سەر هاوسەرەکانیانا هێناوە، قسەت بۆ ئەم دیاردەیە چیە؟

**ش.بێکەس:** دیاردەیەکی جوان نیە. لە بنەڕەتیشدا دژی بیرو باوەڕی یەکسانی ژن و پیاوو لێکدانەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێشکەوتوخوازیی سەردەمەو دروشمەکانی تێکۆشان و (بۆ ل:٣٧)

# ئەوەی سەقاقوش قوتی ئەدات ئاژمێرریێت

ناله

ماسیگرەیەک لە گوێ ئاوێک ئەنیشێتەوە. کە سەر هەڵ ئەبرێت لەبەردەمی سەقاقوشێکدایە. یەکسەر ڕوی تێ ئەکاو ئەڵێت:
– گەورەم! ئەمشەو تا بەیانی خەوم لێ نەکەوت. لەبەر ئازاری ویژدانم هەر جینگڵم داوە. ئێستاش هاتومەتە خزمەتتان ڕزگارم کەن.
سەقاقوش کە لەبەر تێریی نەیئەتوانی قوتی بدات بە دەموچاوێکی ترش و مۆنەوە ئەڵێت:
– بڵێ چیت لێ قەوماوە؟
ماسیگرە بچکۆلەکەش کە لەترسا هێزی فڕینی لەبەر بڕا بوو ئەکەوێتەوە قسە:
– سەرداری ڕوبار! دوێنێ ماسییەکی لەخۆبێزار خۆی هەڵدایە دەممەوە. ئەم ماسییە کە دیار بوو ماسیە گەورەکان هەڵیان بڕی بوو، هەر بەقەدەر نیوەی دەنوکم ئەبوو. کە خۆشی هەڵدایە دەممەوە نیازم وابوو تەنها سەرەکەی بخۆم و لەشەکەشی بهێنمە خزمەتت. بەڕێزیشت ئەزانێت کە هێژامان بلیمەت و زانیارەو پێویستی بە خواردنی مێشک نیە. ئێمەی ڕیوەڵەش لە دەورت بۆئەوەی ئەقڵمان بە چاکەوخراپە بشکێت، یاسا پیادەکەین و نەیەڵین شارستانیی لەم چەمەدا زەفەری پێ ببرێت، پێویستمان بە خواردنی مێشکە.
سەقاقوش دیار بوو کاتی خەوی بوو وتی:
– ئەقڵ بە من مەفرۆشە، بڵێ چەند ماسیت خواردووە؟
–سەرۆکی فەرماندە! بابی هەموومان! نەوەی ئاسمان! هێژا سەقاسەقاقوش!: یەکێک.
– ئەی چەندت لە من زیاتر خواردووە؟
– مایەی شانازیی! گلێنەی چاومان! پاشای شیوو!: هەر یەکێک.
–بڕۆ بەخشیمیت. بەڵام جارێکی تر لەخۆتەوە دەمت مەکەرەوە!


TECKNING: ERNEST GRISET (1843–1907)

ماسیگرەکە ئەفڕێتەوە بۆماڵەوە. ژنەکەی کە ناردبوی بۆ پەیداکردنی خواردن بۆ خۆی و بێچووە برسیەکانی، هەر لە دورەوە هاواری لێ ئەکات:
– کوا چیت بەچی کرد؟
ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێت: دەمت داخە نەبا ماسیەک خۆی هەڵ بداتە دەمتەوە! ●
١٩٩٧/٣/٢٥

**مرۆڤی تاک لەبەردەمی زۆردارێکدا چی بۆ ئەمێنێتەوە بیڵێت!**

# هەواڵەکان چی ئەگەیەنن؟

ناسر حەفید
٨-١٩٩٧

سالی ١٩٧٠ جەلالی لە باوەشی حکومەتی عێراقدا ئاشبەتالی کرد. مەلایی سالی ١٩٧٥ لە باوەشی ئێراندا بۆی سەندەوە. ئەم دوو کارەساتە دوو چەقۆ بوون لە میللەتەکە دران.
دوای شەڕی کەنداو، دامەزراندنی "ناوچەی پارێزراو" و بەجیهانیبوونی کێشەی کورد، دەستێوەردانی جولانەوە چەکدارییەکەی باشور بۆ داگیرکەرەکانی کوردستان ئاڵۆز بوو. لەوە شارەکانیان داو کردنیان بە دوو بەشەوە. مانگی ٥ی ١٩٩٤یش دەستیان کرد بە شەڕی یەکترکوژیی. ڕۆژی ١٩٩٦/٨/٣١ مقەستەکە بۆ لەتکردنی ناوچە پارێزراوەکە کەوتە جولان. سوپای "سەددام حوسەین" کە ڕاپەڕینی خەڵک لە کوردستانی پاک کردبۆوە، "پارتی" پێش خۆی داو هاتەوە هەولێرو ئالای عێراقی لەسەر خانوی پەرلەمان هەڵ کردەوە.
ئەم هەلە بە یەک دەست نەئەخنکا. پرۆسێسی خیانەت ئێستا لە سەر یەک تەوەر ناڕوات. مەسەلە هەر ئەوە نەبوو کە پارتی پێش سوپای عێراق بکەوێت، بەڵکو ئەوەش بوو کە "یەکێتی" یش دەبوو ناوچەکانی خۆی چۆڵ بکات. ئەو ئیعدامکردنەی ڕۆژی ٨/٣١ تەنفیزی حوکمێک بوو ڕۆژی ٩١/٤/١٩ درا کە سەرکردەی حیزبەکان بە تۆپەڵ چوونە بەغداد. "یەکێتی" پاش پێنج ساڵ لافلێدانی دروستکردنی سوپای پارێزگاریی کوردستان، لە چەند ڕۆژێکدا گەشتە سنوری ئێران و ڕۆژنامەکانی دەرەوە هەواڵی ئەوەیان بڵاوکردەوە کە لەناو ئێرانیشدا، لە قوتە سەربازییەکانی عێراقەوە، خەڵکی ڕاکردوو





دەرچوو کە هەر کام لەو دەوڵەتانە دەستی تەنها خۆی بەرێت بۆ ڕێکخراوەکان و بۆ مەبەستی خۆی بەکاریان بهێنێت. بوو بەوەی کە کورد خەریک بوو ڕزگار بێ و هەر هەموو مەسەلەکەیان لە دەست بچێت. ئەم ئاڵۆزبوونە وای کرد کە دوژمنەکانی کوردیش خۆئامادەکردنێکی تازەیان لە بەرامبەر کێشەی کورددا هەبێت. ئەمانیش بە مێتودێکی نوێ و دەستیاوێکی ئاڵۆزەوە کەوتنە گیانی ئەو هەلە مێژووییەی بۆ کوردی ڕاوکراو هەڵ کەوت. چۆن؟
لە تاکەدەستەکانی خۆیان کۆدەستێک و لە دوو چەقۆکەش مقەستێکیان دروست کرد. ڕۆژی ١٩٩١/٤/١٩، لە کاتێکدا کە هەموو دنیا دوژمنی سەددام بوو، هەروەها ڕۆژی هەزار منالەکورد لەسەر سنور ئەمرد، سەرکردەی حیزبەناکۆکەکان پێکڕا بەرەو بەغداد کرانەوەو لەم نوقتەیەوە پرۆژەی لەباربردنی هەلە مێژووییەکە دەستی پێ کرد. دواتر، حیزبەکان هەرچی بۆ ئاوەدانکردنەوە ئەشیا کردیان بەودیوداو هەرچی وڵاتیشی پێ وێران ئەکرێت هێنایانە ئەم دیوەوە. وەکو کوللە لە هەموو دامودەزگاکانی بەڕێوەبردنی ناو لێیان ئەکوژرێت. کۆدەستەکە مەسعود بارزانی پێش خۆی ئەدا بۆ گرتنەوەی کوردستان و جەلال تالەبانی یش ئەهێنێت بۆ سەرسنور. سۆندەئەندامەکان و لایەنگرانی یەکێتی ویستیان بە لەپێش سوپای عێراقەوە ڕۆشتنی پارتی خالێک وەر بگرن. خەڵکەکە ببێت بە دوو بەرەوە؛ بەرەی باش و بەرەی جاش. بەڵام ئەفسوس. دەهۆڵی دڕاو دەنگی وا نایەتە بەرگوێ وەکو دەهۆڵژەن ئەیەوێت. یەکێتی لە پرەنسیپەوە نیە کە دژی لەپێش سوپای عێراقەوە ڕۆشتنە.
دەورەکەیە ئەمجارەیان واکەوتۆتەوە کە مەسعود بارزانی بەر سەددام بکەوێت و جەلال تالەبانی بەر ئێران. تالەبانی دواتر ئەڵێت؛ *ئێمە قەت ڕۆژێک لە ڕۆژان دژی مەبدەئی مفاوەزات نەبوین، وەناڵێین گفتوگۆ لەگەڵ حوکمی عێراقدا عەمالەتە، بەڵام وتمان کە ڕیزی یەککرتووی کورد ئەبێت گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتدا بکات و ناشێت حیزبێک لە حیزبە کوردستانیەکان دانوساندن بگرێتە دەست خۆی.(١)* " ئەمەش ئەوە پیشان ئەدات کە تالەبانی لەبەر ئەوە سەددام-هێنانەوە حەرام ئەکات چونکە خۆی تیا نیە. جگە لەوەش

**ئەو شەڕانەی حیزبە سۆندەکان ئەیکەن، شەڕی ئەو وڵاتانەن کە دەستیان تێ خستوون، مەبەستی وڵاتەکان دێنێتە دی و خەڵکی کوردیشی پێ تیا ئەچێت. کورد هێشتا تێ نەگەشتووە ئەو خیانەتەی لێی کراوە چەند قوڵە، ئەو سوکایەتیەی پێی کراوە چەند نزمە.**

ئەگەر حیزبەکان بە کۆمەڵ خیانەتێک بکەن، ئەوا کەسیان لە دەرەوە نامێنێتەوە لەوانی تری بکات بە هەڵا.

## سەوز و زەرد، دوو ڕەنگی جیاوازی تیاچوونن

هەمان هێزی یەکێتی کە ئاشبەتاڵی لێ کرد بۆ سنور، هەولێری لێ دەرئەکرێت و وەکو فلیمی کارتۆن بە چەند ڕۆژێک ئەنێردرێتەوە جێگاکانی خۆی. سەرانی یەکێتی نکۆڵی لەوە ئەکەن کە ئێران پۆستی کردونەتەوە بۆ شارەکان و دروش دەربارەی هەولێرنەگرتنەوە ئەوە بوو کە ئەیان وت: "کەی خەڵکەکە ڕاپەڕی ئەوسا ئێمەش ئەچین بە دەنگیانەوە". ئەمەش ئەو ڕاستییە پیشان ئەدات کە خەڵکەکە دەرفەتی ڕزگاربوونی نیە. ئەگەر لە یەکێکیان خۆی نەجات بات ئەوا ئەوی تریان ئۆتۆماتیکیی جێگای ئەگرێتەوە. ئەبێت لەم دوو نەخۆشییە یەکێکیان هەڵ بژێرن! پەتای سەوزتان ئەوێت یان پەتای زەرد؟ واتە، لەژێر دەسەڵاتی حیزبەسۆندەکاندا، ئازادیی کورد ئازادیی هەڵبژاردنی تیاچوونە، تیاچوونی سەوز یان تیاچوونی زەرد! بۆ یەکێک مەسەلەکە سەرکەوتن بێت لای، هیچ جیاوازییەک لە نێوانی ئەوەدا نرخی نابێت کە وەکو پارتی کورد تیا پچێت یان وەکو یەکێتی.

ئەو پەیامەی یەکێتی لە دەستیا بوو، لەگەڵ جۆری هاتنەوەکەیدا کە ناردنەوە بوو لە لایەن ئێرانەوە، هاوئاهەنگ بوو. "یەکێتی" سنگی خۆی بەوە هێنایە پێشەوە کە بەرگریی لە یەکێتی خاکی عێراق ئەکات بە شیمال و وەسەت و جنوبەوە. نزار حەمدون کە نوێنەری عێراقە لە نەتەوە یەککگرتووەکان، لەسەر تەلەفیزۆنی م.ب.س، لە بەرنامەیەکدا لەگەڵ نوێنەری پارتی (وشیار زێباریی) و نوێنەری یەکێتی (عەدنان موفتی) دا، وتی کە حکومەتی عێراق هیچ ناکۆکیەکی ستراتیجیی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی دا نیە، مادام هەموو لایەک هەوڵی پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق ئەدات. سەرکردەی حیزبەکان ئەو هەموو خەڵکەیان لە پێناوی چیدا بە کوشت داوە، پرسیارێکە بە پلەی یەکەم یەخەی ئەو کەسانە ئەگرێتەوە بیکەن کە خۆیان و کەسوکاریان سوتەمەنی و تیاچووی جولانەوەکە بوون.

## بۆ هەولێر بەر پارتی ئەکەوێت؟

جگە لە کوشتنی "دکتۆر شڤان" ی کوردستانی تورکیا، کوشتنی فایەقی موعینی، تەسلیمکردنەوەی برادەرانی موراد شیرێژ، تیرۆرکردنی قادر شەریف ی کوردستانی ئێران، پارتی هەتا ئێستا وەکو ماتۆڕ لەپێش سوپای سێ داگیرکەری کوردستانەوە ڕۆشتووە. لەبەر ئەوە لە پێشبڕکێی وەرگرتنی قۆنتەراتی خوێندا، لەم بازاڕی نیشتیمانفرۆشییەی ئەمڕۆدا، هەمیشە پارتی لە یەکێتی ئەباتەوە. ئەوەی یەکێتی سوپای ئێران دێنێتە سەر کۆیە لای پارتی کۆنە. پارتی بە حوکمی سترەکتورو مێژووی، دەستیاوێکە لە یەکێتی پڕتاوترە بۆ جێبەجێکردنی قۆنتەرات و لەبارترە بۆ بەدیهێنانی مەبەستی وڵاتان. بۆیە پارتی دەبێت لە هەمووان زیاتر دەست بە باڵییەوە بگیرێت، جگە لە "برایم خەلیل" پێویستە هەولێریشی لەژێر دەستدا بێت.

ڕۆژی ١٤/٥ سوپای تورکیی ماتۆڕەکە پێش خۆی ئەداو بۆ کوشتنی



**تاوانی ئەو سوپایەی "پارتی" لەپێشیەوە ئەڕوات.**



**وێنەی سەربازی تورکیی کاتێک کورد سەرئەبڕن و ڕەسم بە سەرەکەیەوە ئەگرن.**

## چەقاندنی ئاڵای داگیرکردن لەسەر لوتکەی نیشتیمانێک، تەنها بلیمورالیی میللی ئەو کەسانە ناگەیەنێت کە ئیهانەیەکی وا گەورە قبوڵ ئەکەن، شەرمەزاریی میللەتی داگیرکەریش نەشەکێنێتەوە.

پ.ک.ک هەتا هەولێر دێت. پڕۆسێسەکان لەسەر یەک تەوەر ناڕۆن، هەر ئەوە نیە کە پارتی لە پێش سوپای تورکییەوە ئەڕوات، بەڵکو ئەوەشە کە (یەکێتی) یش ئەبێت لەو کاتەدا تەشقەڵە بۆ پارتی دروست نەکات. کۆدەستەکە دەستی چەند وڵاتێکە. دەنا چۆن مەسعود بارزانی ئێوارە قزعەی سەددام ئەخواو بەیانی لە پێش سوپای تورکییەوە دێت!

### دوژمنی کورد ئەوە نیە بە زمانێکی تر قسە ئەکات

لە کاتێکدا ئیسماعیل بێشکچی تورک لەسەر کورد لە بەندیخانەی تورکیا دایە، سەرکردەی حیزبە کوردیەکان ڕزگاربوونی کوردستان بە لەتکردنی عێراق لەقەڵەم ئەدەن. ئەم والەقەڵەمدانەش بێجگە لە بەکرێگیراویی و خیانەتی سەرکردەی حیزبەکان بەرامبەر بە کورد، لێدانێکی گەورەشە لە جوڵانەوەی دیموکراتی و شارستانێتی میللەتی عەرەب لە عێراقدا. چونکە حکومەتی میللەتێک میللەتێکی تر داگیر بکات، زەحمەتە بتوانێت مافە بنەڕەتیەکانی خەڵکەکەی خۆشی دابین کات. ئەو (سەددام)ەی چەکی کیمیاوی ئەدات بە هەڵەبجە دا، هەر ئەو (سەددام)ەیە کە هۆزە عەرەبیەکانی خواروش تەخت ئەکات.

**حیزبەکان لەبەرئەوەی فۆرمی جیاوازی یەک ناوەڕۆکن: "حیزبی سۆندە"، هەمیشە تێکەیشتنیان هەیە بۆ خیانەتی یەکتریی. کاتێک لایەکیان قۆنتەراتی خیانەتێک وەر ئەگرێت، ئەوی تریان لە جێگایەکدا نیە لە لایەنی قۆنتەراتەکە لێوەشاوەتر بێت. حیزبە سۆندەکان حیزبی سیاسی نین تا دژی خیانەتەکە خۆی بن، ئەوەی یەکێکیان ئەیکات ئەوەیە کە ئەوی تریان پێشتر کردویەتی یان دواتر ئەیکات. ئیتر چۆن بتوانن دژی ڕابوردوو یان داهاتوی خۆیان بوەستن؟**



لە کاتێکدا لە فەلەستین، فەرمانی کوشتن دەرئەکەن بۆ هەر عەرەبێک زەویەکەی خۆی بفرۆشێت بە جولەکە، لە باشوری کوردستاندا یەک مەتر زەوی نادۆزیتەوە حیزبەکانی نەیان خستبێتە ژێر دەسەڵاتی یەکێک لە دەزگا جاسوسیەکانی وڵاتانی ناوچەکەوە.
تەلەفیزۆنی (ئێم.بی.سی) عەرەبی لە هەواڵەکانی چونەژورەوەی ١٥/ ٥ی سوپای تورکی و جاشی کوردا بۆ کوردستانی عێراق، سوپای تورکیای پیشان دا لەسەر بەرزترین لوتکەی ناوچەکە ئاڵای تورکیی هەڵ کردبوو. لە دامێنی لوتکەکەشدا چەند لاشەیەکی کوردی کوژراو کەوتبوون، ئەفسەرەکە وتی: "ئەو چەکانەی گرتومانن ئەیان دەین بە: پارتی".
نەک عەرەبی عێراق، بەڵکو وڵات و لایەنی عەرەبیی دیکەی وەکو سوریا و فەلەستینییش، لەسەر هاتنەژورەوەی سوپای تورکیی ناڕازیبوونی خۆیان دەر بڕیەوە، ئەمە نەک لە سەر خاکی خۆیان بەڵکو لەسەر خاکێک کە نەک خۆشیان بەڵکو وڵاتێکی عەرەبیی تریان داگیری کردووە. حیزبەکوردیەکانی باشوریش؛ لە پێش سوپای داگیرکەرەکەوە ئەڕۆن، لەژێر دەسەڵاتی ئەماندا تورکمانێک لە قوتابخانەیەکی کوردستانی عێراقدا نەخشەی کوردستان ئەدڕێنێت، دەزگا جاسوسیەکان کوردی پارچەکانی تر تیرۆر ئەکەن. ئەمانە ئەوە ئەگەیەنن کە حیزبەکان خۆیان لایەنی داگیرکردنەکەن و ئەوانەی کە ڕەخنەش لە حیزبەکان ئەگرن وا نەکەن، سەر بە هەمان کولتورن کە حیزبەکانیشی لێ دروست بوون. دەنا حیزبەکان دەمێکە ئەو قۆناغەیان بەجێ هێشتووە ڕەخنەیان لێ بگیرێت. شتێک لەوانەی سەری لە خەڵکی کورد تێک داوە، جگە لە زمانی قسەکردن، ئەوەیە کە لایەنێکیان نەماوە بۆ کوردی بکات تا ئەوی تریان بە "جاش" قەید کات.

### پارتی سوپای تورکیای نەهێناوە

هەندێ کەس ئەڵێن: پارتی سوپای تورکیای هێناوە. پارتی هێزێک بوایە بیتوانیایە سوپای وڵاتان بجوڵێنێت، نەی ئەهێنانە سەر کوردستان، ئەی بردن "کوێت" ی پێ ڕزگار ئەکردن. سوپای وڵاتانهێنان جیاوازیی هەیە لەگەڵ ئەوەدا کە لەپێش سوپای وڵاتانەوە بڕۆیت.
لە مانگی ١١ی ١٩٩٦دا، هەواڵی کوشتنی نزیکەی ٢٨ لاوی کوردستانی عێراق بەدەستی سوپای تورکیی گەیشتبوو. پاش ئەوەی بە شێوەیەکی دڕندانە کوشتبویانن، لاشەکانیان فڕێ دابوونە لۆریەکەوەو ناردبویاننەوە بۆ شارەکانیان. سەفارەتی تورکیا لە سوید ڕازی نەبوو نامەیەکی پرۆتێست نە وەرگرێت نە بشخرێتە سنوقی پۆستەکەیانەوە. ئەم هەڵوێستەی سەفارەتی تورکیی لە ستۆکهۆڵم ڕێکەوت نەبوو. دکتۆر مەحمود ئەگێڕێتەوە کە مەلا مستەفا وەختی خۆی نامەیەک ئەنێرێت بۆ حکومەتی تورکیی، بەڵام لەوسەرەوە نامەکەی بە هەڵنەپچڕاوی وەکو خۆی بۆ ئەنێرنەوە. جەوهەری مەسەلەکەش ئەوەیە ئەوان دان بە تۆدا نانێن تا قسەت لەگەڵدا بکەن. ئەم هاتوچۆیەی ئەمڕۆی حیزبەکانیش ئەوە ناگەیەنێت کە

**موشیر کە لە بازیان هاتە خوارێ بۆ ئەوە نەهات دەربەندێک بگرێت،بۆ ئەوە هات دەسەڵات بگرێتە دەست خۆی. موشیر جاران زەلامێک بوو، ئێستا وەکو "زەعیم" بووە بە ڕوتبە سەرکردەی ئەو حیزب و هێزانە وەری ئەگرن کە لە پێش سوپای داگیرکەرەوە دێنە سەر نیشتیمانەکەی خۆیان.**

حکومەتی تورکیی نامەیەکی کوردیی کردۆتەوە. حکومەتی تورکیی شەڕی دژی کورد لە کوردستاندا بە کورد خۆی ئەنجام ئەدات. ئەم جۆرە ئەنجامدانەش چەند خاڵێکی بنەڕەتیی تیایە لەوانە:

١-شەڕ ئەگەر هەر تورک بیکات لەناو کوردا هەستی نەتەوایەتیی و یەککگرتنی کورد بەهێز ئەکات، بەڵام ئەگەر لە ڕێگای حیزبەکانەوە بیکات ئەبێتە شەڕی نێوان پارتەکان و لە گەلێک ڕوی ترەوە زیانی کوشندە بە میللەتی کورد ئەگەیەنێت.

٢-ئەو پارەیەی ئەیدات بە موشیرەکان لەوە کەمترە کە ئەچێتە بەکارهێنانی سوپای تورکیی.

٣- شەڕ ئەگەر حیزبە کوردیەکان بیکەن، جگە لەوەی کە حکومەتی تورکیی فشاری جیهانیی نایەتە سەر کە سنوری وڵاتێکی تری شکاندووە، ئەوەش پیشان ئەدات کە کورد لەو ئاستەدا نیە حوکمی خۆی بکات.

ئەو پیاوانەی لەناو کورد خۆیدا قەبەو بەسامن، لەبەردەمی دەزگا جاسوسیەکانی داگیرکەرەکانی کوردستاندا قەرەقۆزن، خۆیان فویان تێ ئەکەن و خۆشیان بەتاڵیان ئەکەنەوە. ئەوەی کە ئێمەش حیزب و سەرکردەی وامان هەیە، هیچ نیە جگە لەوەی کە خەڵکێکی داماو و ڕۆحسەقەتین.

## داگیرکەرەکانی کوردستان ئەیانەوێت چی بە کورد بڵێن؛

کۆدەستەکە بەوە ڕاناوەستێت کە ئەو هەلەی بۆ کورد هەڵ کەوت هیچی تیا نەکرێت، بەڵکو ئەوان ئەیانەوێت نەک نەوت، نەک هەلی مێژوویی، بەڵکو هەر کوردبوون خۆی بۆ کورد بکەن بە بەڵا.

کوردلەناوبردن قۆناغی دژایەتی دەرەکیی تەواو کردووە. لەوە دەرچووە کیمیاوی بەکار بهێنێت، زمان قەدەغە بکات، گوند ڕاگوێزێ و ملی لاوەکانی بکات بەپەتدا. لەوە دەرچووە پەنجەیەک ببڕێتەوە، ئەیەوێت هەر سیستێمی لەشەکە خۆی نەهێڵێت. باشترین دەستیاویش بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە مقەستەکەیە. ئەو تاوانانەی کە هەرگیز دەستی داگیرکەرەکانی ناگاتێ، دەستی خیانەت لە کورد خۆی بە ئاسانی ئەیان گاتێ.

سوپای ئێران و سوپای تورکیا، ناتوانن بێنە سەر کۆیەو هەولێر، ئەگەر موشیری سەوزو موشیری زەرد نەبێت. هاتنی ئەم دوو سوپایە بۆ سەر کوردستانی باشور، لە لایەکەوە کاریگەریی گرانی سیاسی و ڕۆحیی هەیە لەسەر کوردو لە لایەکی ترەوە تاقیکردنەوەو کولتورو هاوکاریی داگیرکەرەکانی کورد بەرجەستەو پتەو ئەکات. هاتنی ئەم دوو سوپایە بە ئاسانی ئەم خاڵانە ئەگەیەنێت:

١- لە ڕوی سیاسیەوە ئەوە ئەگەیەنێت کە پەیوەندی داگیرکەرەکانی کوردستان بۆ دژایەتی کورد لە دەرەوەی ناکۆکیەکانیانە. بەڵام پەیوەندی کوردو کورد سفرە. ئەمەی دواییش نەبوونی سیاسەتی کوردیی دوپات ئەکاتەوە. پارتە سۆندەکان مافیائاسان و بە کەڵک وەرگرتن لە هەستی نەتەوایەتی خەڵکی کورد، لە فۆرمی جۆراو جۆردا، دەور بۆ وڵاتان ئەبینن.

٢- لە ڕوی سایکۆلۆجیەوە ئەو شوێنەوارە قورسە لە ڕۆحی کورددا بەجێ ئەهێڵێت کە ئەگەر حکومەتی مەرکەزیی وڵاتەکەش نەبێت، ئەوا حکومەتی لەتەداگیرکراوەکەی تر هەیە بێتە سەرتان.

کوردکوشتن لە ناو شاری هەولێردا لە لایەن حکومەتی تورکییەوە، وێنەی داڵێکی چاودەرهێنەری تر لە چاوی خەڵکییدا بەجێ دێڵێت کە کورد ئەبێت قوڵتر بترسێت.

## موشیر چیە؛

ئەحمەد تەقی ئاوا دەربارەی موشیری حەمەی سلێمان ئەنوسێت:

"شێخ لە دەربەندی بازیان چاوەڕێی لەشکری ئینگلیزی ئەکرد. داگیرکردنی گەروەکەی دەربەند بۆ دوژمن ئاسان نەبوو. شێخ هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوو وە بیری لەوە نە ئەکردەوە کە یەکێک لە دۆستەکانی خۆی ناپاکی لێ بکات. ئەوە بوو (موشیری حەمەی سلێمان)ی بەگزادەی هەمەوەند کە شێخ خۆی کردبووی بە سەرکردەی سواری چەمچەماڵ، ڕێگای پیشانی ئینگلیز داو لە ڕێگەیەکی واوە هێنانی و پشتی لێ گرتن کە شێخ هەرگیز بە بیریدا نە ئەهات لەو جێگایەوە ئینگلیز بتوانێت بێتە ئەم دیوو. شێخی قارەمان ئەوەندەی زانی لە بەرەبەیانی ١٨ی حوزەیرانی ١٩١٩دا بە چەکی تازەو زۆرەوە پشت و پێشی لێ گیراو فڕۆکەش لە ئاسمانەوە ئاگربارانی ئەکات. ئەو لەشکرە ئینگلیزیەی هاتبووە ئەم دیوەوە لە هەموو چیزەیەکی تێدا بوو، هەتا سیک و مەغۆلەکانی بۆرماش بەشداریان تێدا کرد. هەردوو لەشکر ئەوەندە لێک نزیک بوونەوە ناچار دەستیان دایە شیرو خەنجەر. لەشکری کورد بە ژمارە زۆر لە لەشکری دوژمن کەمتر بوو. ئا لەم کاتەدا بوو کە قارەمان لە دوو لاوە بریندار کراو بەمە لەشکری کورد شکاو شێخ بە دیل گیراو بەرەو بەغداد ڕەوانە کرا"(١). دوای گرتنەوەی هەولێر لە لایەن سوپای عێراقەوە بە بەشداریی هێزەکانی پارتی، تێرمی "موشیر" لە ڕێگای محەمەد ڕەسوڵ هاواری مێژوونوسەوە لە گۆڕەکەی هاتەوە دەرەوە. موشیر جاران زەلامێک بوو، ئێستا وەکو زەعیم، بووە بە ڕوتبە سەرکردەی ئەو حیزب و هێزانە وەری ئەگرن کە لە پێش سوپای داگیرکەرەوە دێنە سەر نیشتیمانەکەی خۆیان.

حیزبەکان جیابونەوەو دروستکردنی حکومەتی سەربەخۆی کوردستان بە تاوانی لەتکردنی خاکی عێراق ناو ئەبەن. لافی ئەوە لێ ئەدەن کە پارێزگاریی لە خاکی عێراق ئەکەن بە شیمال و وەسەت و جنوبەوە. ئەوان کە خۆیان پیاوی ئێران و تورکیاو عێراقن ئەبێت ئەوەی کە یەکێتی عێراقی لێ بپارێزن کێ بێت؟ ئایا هەر ئەوانە نین کە بە ناوی ڕزگاری کوردەوە خۆیان بە کوشتیان دان؟ ئەوان کە خۆیان کورد بن و دژایەتی سەرەتاترین مافی سروشتیی میللەتەکەی خۆیان بکەن ناشێت عەرەبێکی خراپی وەکو سەددام بن. بەریتانیا دوای ئەو بەرگری و کوشتارانەی لە کوردستان و عێراقدا لە سەرەتای ساڵی ١٩١٩دا توشی هات، لە مانگی ٣ی ١٩٢١دا لە کۆنگرەی قاهیرەدا بڕیاری دا حوکمی ڕاستەوخۆ بگۆڕێت بە حوکمی نا ڕاستەوخۆ. ئەوە بوو ئەمیرفەیسەڵیان لە (٨/٢٣)ی هەمان ساڵدا بە

**ئەو هێڵە سورانەی پارتی سۆندە ناتوانێت لێیان دەرچێت:**
**یەکەم ئەبێت گۆڕەپانی شەڕ کوردستان بێت. دووەم بۆ کورد نەهاتووە دەست لە "نەوت"ەوە وەربات.**
**هەر ڕێکخراوێک بتوانێت ئەو هێڵانە بشکێنێت دەسکەوتێکی سیاسی گرنگ بەدەست دێنێت.**

مەلیکیی نارد بۆ عێراق(٣). موشیرش کە لە دەربەندی بازیانەوە هات بۆ ئەوە نەهاتە خوارەوە دەربەندێک بگرێت، بەڵکو بۆ ئەوە هات کە دەسەلات بگرێتە دەست خۆی. ئەو ئاشبەتاڵانەی بە جوڵانەوەی کورد کراوە تێشکانی سەربازیی نەبوون. ئاشبەتاڵ و لەپێش سوپای داگیرکەری کوردستانەوە ڕۆیشتن، ئەو ڕوداوانەن کە هەموو جارێک دەستی دوژمنەکانی کورد لە پشت جوڵانەوەکانەوە بە زەقی پیشان ئەدەن. لەم مەیدانی تێکشکانانەی "خەتی سەربەخۆبوون"ی کوردیشدا، هەرجارەو سەرهێزێک ئەبێت بە موشیر. موشیر ڕوتبەی پاڵەوانانی ژێرخستنی نەتەوەی کوردە. ئەمەش دیاردەیەکی ئاساییە کاتێک کە مێژووەکە مێژووی تیاچوون بێ و سەرۆکی ڕێکخراویش سەرکردەی ژێرکەوتن.

## کورد دوای سێبەری نەوت کەوتووە

دالێک بە ئاسماندا ئەگەڕێت، منالێک دوای سێبەرەکەی ئەکەوێت بی گرێت، کەورەیەک یەکسەر سەری هەڵ ئەبڕێت.
ئەو وتارەی "**هێمن**" دەربارەی نەوت نوسیویەتی قیرەیەکی دالەکەیە کە سەرنجمان ڕائەکێشێت بۆ ئاسمان و ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە هەندێک لەو ڕوداو و بڕیارانەی لەسەر زەوی ئەیان بینین سێبەری لەشێکن بە ئاسمانەوە: **نەوت**.
کاتێ کە وڵاتە پیشەسازییەکان نەتوانن ئەلتەرناتیڤێک بدۆزنەوە بۆ نەوت ناچارن ڕوو بکەنە سیاسەت بۆئەوەی بتوانن کۆنترۆڵی ناوچە نەوتییەکانی پێ بکەن و نەوت نەتوانرێت وەکو چەکێک لە دژیان بەکار بێت. هەشت ساڵ جەنگی ئێران و عێراق، داگیرکردنی کوێت و شەڕی کەنداو، مانەوەی سەددام حوسەین لەسەر کار، ئەمانە هەموویان بەگشتی سێبەری ئەو دالەن کە ئەو چاومان دەرئەهێنێ و ئێمەش دوای سێبەرەکەی کەوتووین.
ئاسایشی سیاسی و دڵنیایی کۆمەڵایەتی لەسەر بنکەیەکی ئابوریی وەستاوە. نەوت یەکێکە لەو فاکتەرانەی کە ڕۆڵی گرنگ لەو بنکە ئابورییەدا ئەبینێت. سەرەتای حەفتاکان، بە بەرزکردنەوەی نرخی نەوت لە لایەن ئۆپێکەوە، گەورەترین ئەزمەی ئابوری کەوتە ناو وڵاتە پیشەسازییەکانەوە. بۆیە کۆنترۆڵی سەرچاوەکانی نەوت لە سیاسەتی حکومەتی وڵاتە پیشەسازییەکان جیا نابێتەوە. چونکە ئەو وڵاتانە هەر پلانێک و سیاسەتێک دانێن بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاکانیان سەر ناگرێت ئەگەر فاکتەری نەوتیش وەکو فاکتەرەکانی تر دیارو دەسبەسەراگیراو نەبێت. ئەوەی ئەوان نەخشەی بۆ دائەنێن ئەکەوێتە بەر ڕەحمەتی ڕوداوەکانی ناوچەی نەوت. بە خۆڕایی نەبوو کە ٢٨ وڵات بەشداریی کرد لە شەڕی دەرکردنی سەددام لە کوێت دا.

ڕوخانی حوکمی سەددام حوسەین هەر ڕوخانی تاقمێک نەئەبوو، ڕوخانی لوتکەی دیکتاتۆریش نەبوو لە ناوچەکەدا کە دور نەبوو زنجیرەیەک ڕاپەڕین و جوڵانەوەی شۆڕش-ئاسای لە سەرانسەری ناوچەی کەنداودا بە دوای خۆیدا بهێنایەو کۆنترۆڵی نەوتی بخستایە مەترسیەوە. هێشتنەوەی حوکمی عێراق لەسەر کار، نانەوەی سەرقاپی ناوچەکەیە. سەددام لەناو حوکمی عێراقدا ئەو خشتەیە کە ئەگەر دەری بێنیت هەموو حوکمەکە ئەڕوخێت. ئەمەریکا پێی خۆشە ئەم خشتە لابەرێت، بەلام گۆڕینی کارێکی مەحاڵە. بۆیە تا ئەمەریکاو وڵاتانی ئەورووپی لەگەڵ گۆڕانکاریی نەبن لە ناوچەکەدا پێیان باشە "سەددام" یش بمێنێتەوە. لەبەرئەوە کارێکی سەیر نیە ئەگەر **سی.ئای.ئەی** دەستی هەبێت لە کەشفکردنی ئەو هەوڵی کۆدەتایانەدا کە لە عێراقدا دژی سەددام کراون.
کورد ئەگەر دەستی نەگاتە نەوتەکە ناتوانێت ڕۆڵێکی کوردیی لە بڕیارو ڕوداوە گرنگەکاندا هەبێت. کوردیش لە خواروی کوردستاندا بە دەست حیزبەکانەوەیە. ئەوجا ئایا حیزبەکان پیادەی سیاسەتێکی کوردیی ئەکەن تا بەدوای ئەوەدا بگەڕێن دەستیان بگاتە نەوتەکە؟ ئایا حیزبەکان دەمی لێ دەرچێت لە پراکتیکدا ئیش بۆ کورد ئەکەن تا لە حسابی نەوتدا فاکتەری کورد بێتە پێشەوەو بەشی خۆی هەبێت لە بڕیارەکاندا؟
وەلام: نا. حیزبەکان بە گشتی هیچ سوکایەتیەک نەماوە بە کوردیان نەکردبێت، بەلام شتێکی باش نادۆزیتەوە بۆ کوردیان کردبێت. حیزبە سۆندەکان هیچی کوردیان پێ نیە، ئەوەی بێگانەش کە پێیانە ئەوەیە کە بە بەرچاوی هەموومانەوە بەسەر کوردیا ئەهێنن.
جوڵانەوەی چەکداریی کورد بە حوکمی حیزبە سۆندەکان چەند **هێڵێکی سور** هەیە نابێت لێیان دەرچێت، لەوانە؛ **یەکەم** ئەبێت گۆڕەپانی شەڕ کوردستان بێت و **دووەم** نابێت دەست لە "نەوت"ەوە وەربات. داگیرکەرەکانی کوردستان هەرچەندە دژی یەکتریش کار بکەن بەلام لەبەر بەرژەوەندی خۆیان ڕەچاوی هێڵە سورەکان هەر ئەکەن. ئێران لە ترسی تاران دەست لە بەغداد نادات. ئیتر ئەگەر کورد لە کوردستاندا قوتەیەک بگرێ و حکومەتیش دوای ئەوە چەند گوندێک بسوتێنێت ئەوا لە هەردوو لاوە سود بەخشە.
بۆیە گواستنەوەی گۆڕەپانی شەڕ بۆدەرەوەی کوردستان و ئامادەکردنی خەڵکی کوردستان وەکو میللەتێک کە بتوانرێت کۆنتراکتی لە گەڵدا بکرێ و گەرەنتی ئاسایش لە ناوچە نەوتەکانیا بکات، دوو خاڵی گرنگی سەربازیی و سیاسین لە ستراتیجێکی کوردستانیی دیاریکراودا. شکاندنی ئەو خەتە سورانەی حیزبە سۆندەکان ناتوانن لێی دەرچن دەسکەوتێکی سیاسی گرنگە بۆ هەر پارتێکی سیاسی.
کاتێک کەرکوک لە ڕاپەڕینەکەدا کەوتە دەست حیزبەکان، حیزبەکان چونکە ڕێکخراوی سیاسی نین، ئیشیان بەوە نیە نەوت بگرن بە دەستیانەوە بۆ ئەوەی مەرج و داواکاریی سیاسی پێ قوت بکەنەوە، بە پێچەوانەوە، دوژمنانی کورد لە ڕێگای ئەوانەوە دەستی کورد لەو شوێنە گرنگانە ئەکێشێتەوە. حیزبەسۆندەکان لەگەڵ بەجیهانیبوونی کێشەی کوردا، هەر زوو لە ڕێگای تالانیی و شەڕەخۆریی و داردەستیەوە مەسەلەی سیاسی کوردیان کرد بە مەسەلەی سواڵ و چادر. خەڵک بە گشتی تا ئێستا نازانێت ئەو تاوان و خیانەتەی سەرکردەی حیزبەکانی لێیان کردووە چەند گەورەو قوڵە، ئەو سوکایەتییەی پێی کراوە چەند نزمە.

**پارتی و یەکێتی دوو وەرەقەی چلکنن هەموو لاکان لە دەستی یەکترییدا ئەیان ناسنەوە. حیزبەکان تیاچوونی کوردیان گەیاندۆتە پلەیەک کە ئیتر ئەبێت گروپی"تورکمان" و "ئیسلامیی" بە قەدەغەکردنی وشەی "کوردستان" و "ناوی کوردیی" سلاواتی پێ لێ بەنەوە.**

کورد ئەمڕۆ وەکو منداڵەکە بە دوای سێبەری نەوتدا ڕائەکات. ئەنجامی ئەم ڕاکردنەش ماندوبوون و بێ هیواییە. هەندێک کەس هەندێک جار لە ئاکامی ئەو هەموو کوشتارو برینەدا کە بەسەر کوردیدا ئەهێنن، لە دڵی خۆیاندا ئاوات بەوە ئەخوازن کە ئەم نەوتە وشک بکات و ڕزگارمان بێت. بەلام ئەوەی لە گڕی نەوت هەڵ دێت "ئاو" لە دواوە چاوەڕێی ئەکات. "بێنگت لیندستریوم" ئەنوسێت؛ "خەباتی ئاوی خواردنەوەو نەوت ئەبێتە هۆی جەنگ. ئەم دوو شلەمەنیە ئەمڕۆ وەکو نەژادێک لە هەر ناکۆکیەکدان و تا دێ زیاتر ئەبن بە هۆی سەرەکیی".(٤)

## "ئەنفال" و "ڕۆژی حەشر"، دوو دیوی جودای یەک مەسەلەن

ڕەگی شیعارەکانی شۆڕشی فەرەنسی ئەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسوفەکانی پێشووی وەکو جان جاک ڕۆسۆ. حەسەن هەیکەل باسی ڕەگە مێژووییەکانی شۆڕشی ئیسلامی ئەکات. شۆڕشی ئۆکتۆبەر، شۆڕشی چینیی ئەمانە هیچیان لەنەبوونەوە هەڵ نەتۆقان. ڕەنگە نەزانیی نەبێت ئەگەر بڵێم: ئەوەی ئەمڕۆ ڕو ئەدات دوێنێ بڕیاری لەسەر دراوە. ئەو منداڵەی ئەمڕۆ لە دایک ئەبێت بڕیاری نۆ مانگ پێش ئێستایە.

ڕاپەڕین بۆ؟ بۆچی خەڵک بە تەورو مشار هێرشی بردە سەر دەزگاکانی حکومەت؟ هۆکارەکان هەرچەندێک بن یەکێکیان تۆخ و دیارە: ڕۆژی حەشر. ڕۆژی حەشر ئەنفال بۆ کوردی دانا. ئەنفال ناوی سورەتێکی قورئانە مافیاکانی بەغداد بۆ حەملەی نەهێشتنی کورد هەڵیان بژارد. ئەم زاراوەیە چونکە ئەوان دایان ناوە لە ناو کوردا لەبەر هۆی سایکۆلۆجی سۆراغ ناکرێت. خەڵکی کورد بۆ ئەوەی کێشەکە ببینێت چاو نانێت بە کونێکەوە دوژمنەکانی دروستیان کردبێت. ئەوە بۆ ئەوان ئەنفالە. ئەی بۆ کورد خۆی چیە؟

لە تەلەفونێکدا لەگەڵ سلێمانی لە وەڵامی پرسیاری "چۆنن"دا وتیان: "ڕۆڵە لێرە ڕۆژی حەشرە حەشر". کێ هەیە ڕۆژی حەشر نە ناسێتەوە؟ ئەو ڕۆژەی کە هەر لە منداڵیەوە بە گوێماندا دراوە. ئەو ڕۆژەی جگە لە مردن هەموو شتێکی تر کۆتایی پێ دێت. ڕۆژی حەشرێک خوا دای نێت بۆ مرۆڤ بوونی نیە. ئەو ڕۆژی حەشرەی بە ناوی خواوە باسیان ئەکرد هەر ئەوە بوو کە سەدام حوسەین و تاقمەکەی لەسەر زەوی لەژێر ناوی "ئەنفال"دا پیشانی کوردیان دا. خواو باشە لەش و پێستن لە یەک نابنەوە. شەیتان هەمیشە وەکو خوا خۆی پیشان ئەدات. خواو شەیتان تەنها بەیەک شت لە یەکتری جیا ئەکرێنەوە: چاکەو خراپە. ئەوەی بە ناوی خواوە زوڵم ئەکات شەیتانە لە بەرگی خوادا. کێ هەیە ڕۆژی حەشر نە ناسێتەوە؟ ئەم وشەیە هەر من نەم بیست. ئەوانەی لەناو کوشتارەکەدا بوون هەر خۆیان ئەزانن چی بوو: ڕۆژی حەشر.

ئەم دوو زاراوەیە "ئەنفال" و "ڕۆژی حەشر" پێویستە لە یەکتری جیا بکرێنەوە. ئەنفال ئەوەیە کە حیزبی بەعسی عێراق بە خەڵکی بەشێک ناوچەی کوردستانی کردو ڕۆژی حەشریش ئەوەیە کە ئەو خەڵکە بە سەری هات. ئەمە جیاوازە تۆ چاوت ئەنێیت بە کام کونیانەوە، باسی ئەوە ئەکەیت کە ئەوان کردیان یان ئەوەی بە سەر خەڵکەکە هات! ئەمە بێ ئاگایی ئێمە ئەگەیەنێت کە تا ئێستا کارەساتێکی وا گەورە هەر بەو ناوەوە ناو ئەبەین کە دوژمنەکەمان هەڵی بژاردووە.

جولەکەکان تا ئێستاش هەر هەوڵی بیرنەچونەوەی تراژیدیای لەناوبردنیان ئەدەن. کێ باسی ڕۆژی حەشر بگەیەنێت بە خەڵکیی؟

**ئەوانەی نانی تاوان ئەخۆن نایانەوێت هاواری قوربانیەکان بگاتە گوێی کەس. من تا نەمزانی ڕۆژی حەشر چیە، بۆم دەرنەکەوت کە تا ئێستا کورد نەبووم. چونکە ڕۆژی حەشر ڕوداوێکی ئەوەندە گەورەیە هەر کەسێک بێئاگا بێت لێی ئەوەندەی بۆ نامێنێتەوە پێی کورد بێت. کوردبوون هیچ نابەخشێت بە من، بەلام هەڵهاتن لە کوردبوون هەموو لەشم پڕ ئەکات لە شەرمەزاریی.**

## ئەنفالی ٩، ئەنفالی حیزبەکان

ڕۆژی حەشر تێلای دایە دەست خەڵکی ڕاپەڕین. ڕاپەڕین حکومەتی لە کوردستان پاک کردەوە. ڕاپەڕین فەلسەفەی پێ نەبوو ببێت بە شۆڕش. موشیرەکان هاتنەوە بۆ کوردستان و نەیان هێشت قەدماغەی حوکمی سەددام لە کوردستاندا بشکێت. عەگالیان لەسەری تاوانبار داگرت و جامانەیان کردە سەر. سیستێمە زوڵموزۆردارییەکەی "سەددام" یان لە کوردستاندا بەستەوە. کوردستان هەر ئەوەندە بەرقەرار بوو هەتا خۆیان تیا دروست کردەوە. حیزبەکان ئەو ئەنفالەی سەددام خستبویە سەر سکە خستیانەوە گەڕ:

*بنکەیان لە ژێر قەوارەیەکی کوردیدا دەرهێنا. ئەوەی وڵاتی پێ ئاوەدان ئەکرێتەوە؛ شۆفڵ، کارگە، ئامێری خەستەخانە، ڕەوشت، جوانیی هەموویان کرد بەودیوداو لە جیاتی تراکتۆر "کەر"یان هێنایەوە بۆ جوتیاران و دەزگای جاسوسیی ولاتانیشیان لە جێگای پەیکەرەکەی شێخ مەحمودو پیرەمێردی شاعیردا دانا.

*کاروپیشەو پلەوپایەیان لە سەر بناغەی یاسای جەنگەڵ دابەش کرد. لەسەر هەمان پرەنسیپی ڕژێمی سەددام؛ "هەر کەسەو لە ئاستی خۆیدا کۆمەڵێک بەرژەوەندی بدەرێ، ئیتر ئەو کەسە ئۆتۆماتیکیی پارێزگاریی لەو سیستێمە ئەکات کە تیایەتی".

جەوهەری ئەم بیرەش لە پراکتیکدا ئەمە ئەگرێتەوە: کۆمەڵێک "**ئەولادی شەواریع**" بێنە، وەکو سەگی برسی بەری بە لە ماڵ و

**•ڕۆژی حەشر ئێلای دایە دەست ڕاپەڕین، ڕاپەڕین فەلسەفەی پێ نەبوو بیلێت بە شۆڕش**
**•ئەنفالی ٩ مقیاسی نەهێشت؛ هەنگوین و پیسایی تێکەڵاو کرد، سپیی نەهێشت ڕەشی پێ بناسینەوە، ژینێک ئەما پێی بزانین ئەمە مردنە.**
**•ئەنفالی عەرەبیی لە دەرەوە دەست و قاچی کوردەکەی بڕییەوە، بەڵام ئەنفالی کوردیی لە ناوەوە لە سیستیمی لەشەکەی داو توشی هەڵوەشانی کرد.**

ناموسی خەڵکیی.
*دۆزەخی کوردکوشتن لە (٥/١٩٩٤)ەوە داخرایەوە. حیزبەکان لەسەر خراپەکاریی و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ کەوتنە لیستەی ئەمنستیەوە.
*تەوژمیان دایەوە بە ڕەو. ئەوانەی کوردستان بەجێ ئەهێڵن ژمارەیەکیان ئەکەونە بەر لولەی تفەنگی سنورەکان و ژمارەیەکیشیان ئەبن بە مەیتی ناو ئاو. زۆربەی ئەوەی دەریش ئەچێت ئەبێت بە میوانی سەر جادەکان.
*حیزبەکان نەیان هێشت ئەو ئەنفالەی سەددام خستییە سەر سکە واکۆنێکی کەمتر بێت. نیەتی بێ شەرەفییان لێ هێناو کەوتنە ڕاوی ئافرەتان. "لەیلا"ی تازەبوک لە ئەنفالی یەکدا خۆی ئەخاتە باوەشی خەسویەوە، بەڵام سەربازەکان هەر پەلی ئەگرنن و ئەی بەن. ئەنفالی ٩ کە سەرتۆپی ئەنفالەکانە باوەشەکەشی نەهێشت. ئەنفالچیەکانی یەک تا هەشت ئەترسان کورد تۆڵەیان لێ بکاتەوە، بەڵام ئەنفالی ٩ کە دوا حەڵقەی ئەنفالەکانە هەر دڵەکە مابۆوە ئەویشی مراند: جەلال تاڵەبانی لە باسی "حسەین کامیل"دا ئەڵێت؛ "من قسەم لە گەڵ مەرحوم کرد کە بێت بۆ کوردستان لەوێ بارەگای بۆ بکەینەوە، هەرچەندە هەندێک تاوانی کردوە بەرامبەر بە کورد بەڵام گەلی کورد گەلێکی لێبوردەیە"(٤). تاڵەبانی خۆشی ئەزانێت کە مەسەلەکە لێبوردن و لێنەبوردن نیە. بەڵکو ئەوەیە کە میللەت مردووەو مردووش نابێت بە تەرەف. ئەگەر ئەنفالی عەرەبیی سەددام لە دەرەوە دەست و قاچی کوردەکەی بڕیبێتەوە، ئەوا ئەنفالی کوردیی حیزبەکان لە ناوەوە لە سیستیمی لەشەکەی داو توشی هەڵوەشانی کرد.
مەسعود بارزانی تەقەڵ لە ئەنفالی ٨ و ٩ ئەداتەوە، ڕۆژی ٣١/٨/١٩٩٦ سوپای سەددام ئەهێنێتەوە کوردستان. ئەمانە لەوە دەرچوون ئەوە بگەیەنن کە ئەم حیزب و زەلامانە نوێنەری میللەت نین، ئەمانە ئەوە پیشان ئەدەن کە ئەو حیزبانەو دامودەزگاکانیان بە چ شێوەیەک تاوانبارن. ئەنفالی ٩ ئەوەیە کە حیزبەکانی باشور بە کوردی ئەکەن، "تیاچوون"یش ئەویە کە خەڵکی کورد بە سەری دێت. تیاچوون ئەتوانێ "چی" بداتە دەست "چی"، ئەمانە دوو بۆشایین ئەگەر نەتوانین پڕیان کەینەوە بێ خەتا لە مێژووەکە دەرناچین.
دوا وشەم ئەمەیە: دەسەڵاتدارەکان هەرچی بڵێن ئەخوات، زیندووەکان مردوون، ئەوەی زیندووە مردووەکانن جارێکی تر لە گۆڕ بێنەوە دەر، شەهیدەکان: خوێنمان ون نەکەن!*

سەرچاوەکان:
(١) ل٣٠، خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی دا.
(٢) ل٢٠، پێرەش، العراق دولە بالعنف.
(٣) دی نێن، ٩/٨/١٩٩٧
(٤) المشاهید السیاسی، ژ:٤٨، ١٩٩٧.

## بۆ ئاگاداریی

١- ئەوەی ژمارەیەکی بۆ نەچێ و بەشداریی ناکات ئیتر بۆی نانێردرێت.
٢- بەند نین بەوەوە نوسینێک بنێرینەوە بۆ خاوەنەکەی، نوسخەیەک لای خۆت بێ.
٣- وەڵامی بڵاونەکردنەوە لە ئێمەوە لە ڕێگای گۆڤارەکەوە ئەبێت. ئێمە بەناوی بەرهەمەکەیەوە وەڵامی ئەدەینەوە. ئەوەی ئەیەوێت وەڵامی بڵاو نەکرێتەوە بە ناوی خۆیەوە یان بە ناوێکی ترەوە بێ یا بۆمانی بنوسێت.



## ئەوەی بەسەر من هات لە تۆ ڕویداوە

ئەوانەی لە ڕێگا دەخنکێن، دەکوژرێن، دەستیان ئەبڕرێت. کوا کێن ئەوانە؟
ئەوانەی ئەشکەنجەی داگیرکەرانیان دیووە، بە هۆی کوردەوە توشی ناسۆر بوون، کوا لە کوێن ئەمانە؟
لە کوردستان بەردەوام تاوان دەکرێت؛ دزیی، نیشتیمان فرۆشیی، پیاوخراپیی، بۆ لێی بێدەنگن؟
ئەوەی بەسەر تۆ دێت لە ڕێگای تۆوە لە هەمووماندا ڕوو ئەدات. چیت بینی؟ چیت بەسەرهات؟ ئێمە دەسمان ناگاتە تۆ، تۆ بۆمانی بنێرە! خۆمان دای ئەڕێژینەوەو لەژێر ئەو ناونیشانەی سەرەوەدا بڵاوی ئەکەینەوە. کات، شوێن، ژمارە بنوسن!

**ژمارەکانی داهاتوو لەسەر پشتگیریی تۆ وەستاوە. ڕای خۆت بنێرە! بڵاوی بکەرەوە! بەشداریی بکە با بەردەوام بێت.**



**چۆن بیر ئەکەنەوە، ئەوە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە، بەڵام کەڵاوەکەی پشتیان پرسیارێکی سیاسیە لەبەردەمی هەمووماندا.**


**Fax: 018- 25 33 09**

**Adress:**
**M S D C**
**Albert enströmsg.3 tr2**
**754 30 Uppsala Sweden**


نرخی ژمارەیەک لە سویددا ۳۰ کرۆنە، بە پۆستەوە ٤٠ کرۆن.
بۆ دەرەوەی سوید ٤ دۆلار، جگە لە پارەی پۆست.
خاوەنی حسب: S. Ahmed
ژمارەی حسب: Post giro: 6196267-6

**Separation and creation of an independent state is an undisputable right of the people of Kurdistan**




**No one has the right to decide how another person should think or exist, regardless of ethnicity or gender**

***Every authority should resign over a promise which it does not keep***

**Number 1** **A political journal** **January 98**

*In this issue:*







Kurdish refugees;
Towards an unknown future

**Hizbekan leweda nemawin rexneyan lé bigirét**

**Qisekeréki Emeriki: Éme w Sovyet sheri sardman kird, belam Japon birdiyewe**